

# منداڵباز

ڕۆمان

**فەرهاد پیربال**

تێبینی:

هەموو ئەو ناوانەی لەم ڕۆمانەدا بەکارهاتوون، تەنیا دروستکراوی خەیاڵی خۆمن. هیچ یەکێک لەو ناوانە لە واقیعدا نین و ئاماژە نین بۆ هیچ کەسێک لە ژیانی ئەمڕۆ یان ڕابردوودا.

«مەولوود منداڵباز» تەمەنی دەوروبەری چل و پێنج ساڵێک دەبوو؛ لەسەر کورسییەک، لەناو مەخفەری پۆلیسی گەڕەکی تەیراوە: سەر و قژ بژ، قۆڵبەستراو، ملی بەسەر شانیدا شۆڕ ببۆوە، لیقاوێکی پیس بە دەمیدا هاتبووە خوارێ. پۆلیس دایاننابوو تا مەستییەکەی دوێنێ بەری بدات و ئایغ بێتەوە: بۆئەوەی ئیفادەی لێ وەربگرن و وەڵامی پرسیارەکانی پۆلیس بداتەوە.

یاسین، برای یووسف، دوو ساڵ لە یووسف گەورەتر بوو، بە باوکی گوت:
– ڕۆژێک یووسف بە بەردەم حەمام سیروان دا دەڕوا، لە چایخانەکەی بەرامبەر حەمام سیروان «شێرۆ مەدفەع»ڕایدەگرێت و پێی دەڵێ: «وەرە با سەعاتێک بۆ تۆش بکرم».
باوکی یووسف، ڕووی کردە یاسینی کوڕی:
– شێرۆ مەدفەع کێیە؟!
– خوێڕییە. لە چایخانەکەی بەرامبەر حەمام سیروان دادەنیشێ. یووسف خۆی ڕۆژێک ئەمەی بۆم گێڕایەوە. دەیگوت: «ئەم خوێڕییە شەرم پێ دەفرۆشێ».
– منداڵبازە؟
– بەڵێ، بابە گیان. هەموو گەڕەک دەیناسن.
باوکی گوتی:
– دە هەستە، با بچین ناوی ئەم خوێڕییەش بدەینە مفەوەز وریا. هەر ئێستا!
یاسین گوتی: باش!

مام قادری قەیماغفرۆش، بە ئەسڵ خەڵکی کەرکووک، دووازدە ساڵ بوو لە «ئیمام قاسم» دەرکرابوو و لە هەولێر دەژیا؛ بەدرێژایی ئەو دووازدە ساڵە برادەری «مەلا چاو بە کل»، باش یەکتریان دەناسی؛ لەناو مەخفەری پۆلیسی گەڕەکی تەیراوە، گەواهیی دەدا:
ئەو بەیانییە، کاتژمێر حەوت و نیو دەبوو، «مەلا چاو بە کل» لە ماڵی ئێمە بوو. بەڵێ، لەسەر سفرەکەی ماڵی خۆمان فراوینی کرد. بەڵێ، جەنابی مفەوەز، من گەواهیی ئەمە دەدەم و سوێند بە قورئان دەخۆم: لەسەر سفرەکەی ماڵی خۆمان دانیشتبوو. ژن و منداڵەکانیشم شایەدن. خۆ دەتوانن لە ئەوانیش بپرسن! بەڵێ؟! نەخێر جەناب، کوڕە گەورەکەم دووازدە ساڵانە. بەڵێ، بەڵێ، جەنابی مفەوەز، هەموویان ئامادەن گەواهی بدەن: «مەلا چاو بە کل» ئەو بەیانییەی ڕۆژی پێنجشەممە، واتە لە کاتی ڕووداوەکەدا، لە ماڵی ئێمە بوو. پاشان، جەنابی مفەوەز، «مەلا چاو بە کل» چۆن شتی ئاوهای لێ دەوەشێتەوە؟ کەس باوەڕ ناکا مەلایەکی دەستودامێن پاکی وەک ئەو، ئەم کارە دزێوە بکا!

دایکی یووسف، ئەو بەیانییە، لە کاتژمێر هەشتەوە تا نیوەڕۆ، لەناو ژنەکان، هەر دوو قاچی خۆی ڕاکێشابوو، بە هەر دوو دەست لە ڕووی خۆی دەدا و پرچی خۆی دەڕنییەوە و دەکرووزایەوە:
– نازانم، وەیش.. کوێرابیم دایە، ناردم بۆ فڕنەکە سەموون بکڕێ؛ کەچی نەگەڕایەوە.. ئۆوووویش.. نەگەڕایەوە. بە قوربانی بم؛ نە.. گە.. ڕا.. یە.. وە...

پۆلیسەکان، لەناو مەخفەری پۆلیسی تەیراوە، لەودیو پەنجەرەوە تەماشای سەروگوێلاکی عەنتیکە و نوستووی مەولوود منداڵبازیان دەکرد، – لیقاوێکی پیس بە دەمیدا هاتبووە خوارێ. پۆلیسەکان لەناو خۆیاندا بە چرپە و پێکەنینەوە باسیان دەکرد:

– دەڵێن لەوەتەی هەیشە تامی ژنی نەکردووە.

– کەواتە هەقی خۆیەتی.

– چۆن؟

– کە هیچ ژنێک نەبێت تامی بکا، ناچار بووە پەلامار بداتە منداڵان.

– نا.. هەر خۆی حەز لە جنسی مێ ناکا.

– چۆن؟

– دەڵێن رۆژێک کچێکی سفووری جوان بە بەردەمیدا تێپەڕیوە، گوتوویەتی «تەماشا کەن جەماعەت! ئەمە داخوا برایەکەی چەندە جوان بێ!».

یاسین، لە هەمان قوتابخانەکەی یووسف (لە ناوەندیی کارۆخ) دەیخوێند. یاسین پۆلی سێیەم، یووسف پۆلی یەکەم بوو.

ئەو پاش نیوەڕۆیە قوتابییەکانی پۆلی یەکەم و سێیەم بە چاوی سووکەوە دەیانڕوانییە یاسین:

– یووسفی برای یاسین لاقە کراوە.

– یووسف ئەتک کراوە.

ئێستا بێگومان قوتابییەکان ئاوهای پێ دەڵێن!

ئاخ، یاسینی برا گەورە چۆن نەبێتە فرمێسکێک و دانەچۆڕێتە ناخی زەوی!

«مەلایەک لاقەی کردووە»

«نەخێر، منداڵبازێکی گەڕەکەکەی خۆیانە»

«نەخێر، دەڵێن: فڕنیچییەکەی گەڕەکی خۆیان تەعەددای لێ کردووە».

تازە ئابڕوویان چوو! ئابڕووی یاسین چوو. تەواو. عەمری یووسف نەمێنێ؛ چۆن ئاوها لەبەردەم خەڵک سەرشۆڕ و چاوشۆڕی کردن! شاڵڵا هەر چیتر نەدۆزرێتەوە!

ڕۆژی پێنجشەم، دووای کارەساتەکە، دەوروبەری کاتژمێر هەشتی بەیانی، فڕنییەکەی «مەلا چاو بە کل» داخرابوو.

ئەمە یەکەمین ڕۆژ بوو لە ژیانی فڕنییەکەی مەلا چاو بە کلی قوڕئانخوێندا کە خەڵک دوکانەکەی بە داخراوی ببینن!

هەر موشتەرییەکی فڕنییەکە کاتێ دەهات دەرگای فڕنییەکەی بە داخراوەیی دەدیت، دەگەڕایەوە. هەشبوون دەیانپرسی «بۆ داخراوە؟ ».

– دەڵێن: منداڵێکی تێدا ئەتک کراوە.

– چیی؟!

– «مەلا چاو بە کل»!

– مەلا چاو بە کل خۆی؟ منداڵی ئەتک کردووە؟

– چۆن؟!

– نەخێر..

خەڵک بیری بۆ شاگردەکانی دەچوو، نەک خۆی.

مـەولـوود منداڵـبـاز، لەنـاو مـەخـفـەری پۆلیـسی تەیراوە، لەسـەر كـورسـیـیـەكـدا: قـۆڵبەسـتـراو، ملی بەسەر شانیدا شۆڕ ببۆوە، لیقاوێكی پیس بە دەمیدا هاتبـووە خـوارێ. نۆ سەعـات زیاتر بـوو، سەرخۆش، هەر خـــەبەری نەدەبۆوە بۆئەوەی ئـیـــفـــادەی لێ وەربگیرێت و وەڵامی پرسیارەكانی پۆلیس بداتەوە.

چوارشـــانە، كـــەڵەگـــەت، ســـوورە، گـــڕدەنگ، دەموچاوی لە شێرێكی بریندار دەچوو، گوتی:
– بەڵێ منم شێرۆ مەدفەع.
شـێـرۆ مـەدفـەع، تەمـەنـی، چل و پێنج سالێك دەبوو. برای بچـووكی چوار برایان، كە هەمـوویان لە دامـودەزگـاكـانی حكوومـەت كـاریان دەكـرد. لەناو هەمـوویاندا، تەنێ ئەو ئاوها سەرسـەری بوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەش، بە هەر چوار براگەورەكەی – لە كاتی ئاوهادا – لەپشتی دەوەستان و لەسەریان دەكردەوە: بەتایبەتی برا هەرە گەورەكەی، «ڕائید نەعیم»، كە مەسئوول شوعبەی ئیسـتـیخبـاراتی بەعس بوو لە شـاری مـەخـمـوور.. تا ئێـسـتـا سێ جـاران لەسـەر تۆمەتی منداڵبازی بەری دابوو؛ جارێكیشیان لەسەر ئەوەی كە بەسەرخۆشی تەلەڤزیۆنی ناو چایخانەكەی مـــام بایزی شكاندبوو؛ جـــارێكی دیكەش لەســـەر ئەوەی كـە لەناو «حـەمـام شـیـفـا» بە دامـربـۆكس لە نەقـیـب ئەمنێكی خـەڵكی خـانەقـینی دابـوو، – بە نەعـیـمی براشی دەگـوت «لەنـاو حـەمـامـەكـە ڕووت بوو، نەمزانی نەقیبی ئەمنە».
نەعـیـمی برا گـەورەی، هەر جـارێك بیـویسـتـایە بەری بدات، لە مـــەخـــمـــوورەوە تەلەفـــۆنێكی بۆ

دایكی یـووسف، ئەو بەیانییـە، تا نیـوەڕۆ، لەناو ژنەكاندا، بە هەر دوو دەست هەر لە ڕووی خۆی دەدا و پرچی خۆی دەڕنییەوە:
– ئوووی... نـاردم بۆ فـرنەكـە سـەمـوون بـكڕێ؛ نەگەڕایەوە..

شوعبەی ئەمنی هەولێر دەكرد، ئیتر سجنی سەرای هەولێر لەسەرەتادا بە كەفالەت، پاشان لە دادگا چارەسەرێكیان بۆ دەدیتەوە و بەریان دەدا. بەم شێوەیە، خەڵك نەك هەر نەیاندەتوانی ڕقیان لێی بێتەوە، بەڵكو لێشی دەترسان.

مفەوەز وریا هەموو ئەم شتانەی لەبارەی شێرۆ مەدفەعەوە باش دەزانی، لێی پرسی:

– كاك شێرۆ، بەیانیی ڕۆژی پێنجشەم، یەعنی دوێنێ، لەكوێ بووی؟

شێرۆ مەدفەع گوتی:

– لە حەمام بووم. لەگەڵ قلەكەی خۆم.

مفەوەز وریا لێی خوڕییەوە:

– هەندێك بە ئەدەبەوە قسە بكە!

شێرۆ مەدفەع ئەنگوستیلە زێڕە سەر پڕ مووروووە درەوشاوەكانی لە پەنجەی خۆیدا دەسووڕاند، بێ مننەت بە مفەوەز وریای گوت:

– تۆ منت بانگ كردۆتە ئێرە فێری ئەدەبم بكەی یان تەحقیقم لەگەڵ بكەی؟!

مفەوەز وریا نەیدەوێرا پێی بڵێ «تەحقیقت لەگەڵ دەكەم و هەر دوو چاویشت دەردێنم»، پێی گوت:

– چۆن بۆم دەسەلمێنیت كە تۆ لەوكاتەدا لە حەمام

بووی؟
شێرۆ مەدفەع گوتی:
– دەتوانی لە قلەکەم بپرسیت، دەتوانی لە وەستا مەغدیدی حەمامچی بپرسی! یان لە مام جەردیسی ناتر بپرسن، دەی.. خۆ ئەو بیست و چوار سەعات لە حەمامەکەیە: ئەو بەیانییە بە دەستی خۆی پشتی منیش و قلەکەشمی شوشت.. برۆن لە ئەو بپرسن. دەی !
شێرۆ مەدفەع لە کۆتاییدا هێور بووەوە:
– پاشان، مفەوەز وریا، ئەوا دەرکەوت: هەموو تەیرێک گۆشتخۆرن، تەنیا ناوی گورگ بەدە!
مفەوەز وریا پرسی «مەبەستت چیە؟».
- ئیشی ئێمە، حی علی الصلاە ئاشکرایە، بەلاَم ئەو خەڵکەی دیکە، بانگ دەدات و لە قەبرستانان قورئانیش لەسەر گۆڕی مردووان دەخوێنێ، کەچی گورگە و لە پێستی مەڕدایە!
مفەوەز وریا خۆی لێ تووڕە کرد:
– تۆ بۆت نیە بەبێ بەڵگە ئەو تۆمەتە بخەیتە ئەستۆی کەسێکی وەک «مەلا چاو بە کل»!
شێرۆ مەدفەع گوتی:
– ئەسڵەن، ئەو مەلا چاو تەڕەماشە تەنیا پێش

مام قادری قەیاغفرۆش، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە هەر کەسێک لێی بپرسیایە:
– ئەرێ ڕاستە؟!
دەمودەست لە سەرەتادا دەیگوت:
– لا حول و لا قوە الا باللە..
پاشان لە نووکەوە دەستی پێدەکرد بیسەلمێنێ کە ئەم تاوانە پیسە لە «مەلا چاو بە کل» ناوەشێتەوە: بەڵکو لەوانەیە مەولوود مندالباز یان شێرۆ مەدفەع شاگردەکەی مەلایان تەفرەدابێت و لەناو فڕنییەکەی ئەودا ئەوەی ویستوویانە کردبێتیان.

چوار ساڵ، هەموو منداڵانی ئەم شارەی لە زەواق نابوو.. بەم دووا دووایییە لەبرسان هات خووی دایە قورئانخوێنی و خۆی کرد بە مەلا!

– وس س س ..!

– خۆ ئێوە، کە خەڵکی ئەسڵی ئەم شارەن، دەبێ لە من باشتر ئەمە بزانن، جەنابی مفەوەز!

مفەوەز وریا دەیزانی کە شێرۆ مەدفەع بە ئەسڵ لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و دەسڕۆیشتووی مووسڵاوین و نەعیمی برا گەورەکەی، کە مەسئوول شوعبەیە، دەتوانێ هەموو شتێکی لێ بکا؛ نەیوێرا پێی بڵێ «دەمت داخە و گوو بخۆ!»، پێی گوت:

– تۆ بتوانە لێرە بەرگری لە خۆت بکە؛ عەلاقەت بەسەر خەڵکی دیکەوە نەبێ!

شێرۆ مەدفەع گوتی:

– ئاخر خۆ ئێستا هەموو خەڵک دەزانن «مەلا چاو بە کل ئەم کارەی کردووە»؛ لێیان ڕوونە: مەلا چاو بە کل لەناو فڕنییەکەی خۆیدا ئەم کارەی ئەنجام داوە! ئیدی بڕایەوە.

– تۆ خۆت دیوتە؟

– نەمدیوە، بەڵام هەموو خەڵک وای باس دەکەن.

– تۆ ئاگاداری خۆت بە کە خەڵک بە خراپ باست

نەکەن، غەمی خەڵکی دیکەت نەبێ!
– هەرگیز کاری وا لە من ناوەشێتەوە.
– ماشەڵڵا.. شێرۆ مەدفەع..! ئەدی تازە باسی ئەوەت نەدەکرد کە بەیانیی پێنجشەممە خۆت و قلەکەت لە حەمام بوونە!؟
– ئەمە لەگەڵ قلی خۆم. بەڵام من بە حەیاتم بە بیرم نایە کارێکی خراپم بەزۆر لەگەڵ منداڵێک کردبێت. هەرگیز.
مفەوەز وریا لە کۆتاییدا گوتی:
– کاک شێرۆ، ئەگەر قسەی دیکەشت بۆ بەرگری کردن لە خۆت هەبێ، خاوەنی مەسەلەکە شکاتی لێت کردووە و گومانی خستۆتە سەر تۆ. تۆ لای ئێمە تەوقیف کراویت.
– مەبەستت چیە؟
– دەبێ چەند شەوێک لێرە بمێنیتەوە تا تەحقیقت تەواو دەبێ!
مفەوەز وریا بانگی پۆلیسەکانی کرد بۆئەوەی شێرۆ مەدفەع ببەنە ژووری زندانەوە.
شێرۆ مەدفەع کاتێ چاوی بە کەلەپچەکانی دەست پۆلیسەکان کەوت، پەنجەی بەسەر گوڵ و گوڵباعەکانی پشتەدەستی خۆیدا دەهێنا؛ ئنجا

مەولوود منداڵباز، هێشتا هەر سەرخۆش، - ملی بەسەر شانیدا شۆڕ ببۆوە، لیقاوێکی پیس بە دەمیدا هاتبووە خوارێ - تا کاتژمێر شەشی ئێوارەش هەر خەبەری نەبوبۆوە بۆئەوەی مفەوەزی تەحقیقی پۆلیسی تەیراوە لێی بپرسێ:
- کاک مەولوود، تۆ بەیانییەکەی ڕۆژی پێنجشەممە لەکوێ بووی؟

لەبەرخۆیەوە بە حەسرەتێکی تووڕەبوونەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا:
- ئای.. گەووادی منداڵباز!
مفەوەز وریا پرسی «کێ؟»
شێرۆ مەدفەع بە هەمان تووڕەیی و ڕقەوە گوتی:
- قابیلە لەگەڵ تۆم بێ؟!

ئەو نیوەڕۆیە، مام قادری قەیماغفرۆش دانیشتبوو ئامۆژگاریی کوڕە پارچەڵەکەی خۆی دەکرد:
- دەبینی، کوڕم، ئەگەر تۆش بچیتە سینەما و بە چایخانان بکەویت و لەگەڵ خەڵکی گەورەی خراپ هەڵسوکەوت بکەیت، وەک یووسفی کوڕی مام جابیرت بەسەر دێ!
کوڕە پارچەڵەکەی مام قادر لە باوکی پرسی:
- بابە، تەنیا مەولوود منداڵباز و شێرۆ مەدفەع منداڵبازن؟
- نەخێر، کوڕم.. زۆرن.
- ناویان چیە؟
- جەمیل دۆخین، قادر قەنینە، کەریم کەرگێ، تاهیر تەسبیح... گوێت لێبە! ئەوجا ئاگاداری خۆت بە!
- ئەوانە لەکوێن؟
- لە سینەماکان، لە مەسبەحەکان، لە بەردەرکی چایخانەکان دادەنیشن. لە هەموو شوێنێکن. ئیدی جارێکی دیکە نەچیتە سینەما و مەسبەح و چایخانە و مایخانان .. ها ! گوێت لێبە!

ئەو نیوەڕۆیە، مەیتی «ئیبۆ»ی کوڕە تاقانەکەی عومەر پۆخچی (کە تەنیا ساڵێک بوو بەشی کارەبای لە صناعەی هەولێر تەواو کردبوو) لە شەڕی قادسیەی صەدام لە سەنگەری دیزفوولەوە گەڕابۆوە بەردەم مزگەوتی حاجی شەهاب لە گەڕەکی ئیسکان: یازدە گوللە سنگی سمیبوو.. بەڵقیس خانی دایکی یووسف لەناو تازیەی ژناندا، لەتەنیشت پلکە مامری عومەر پۆخچی دانیشتبوو: خۆی کوێر کرد هێندەی بە هەنجەتی گەڕانەوەی مەیتی «ئیبۆ»، بۆ «مەیتی نادیاری» یووسفی کوڕی خۆی بگری.

کاتژمێر یازدەی شەو، پۆلیسێک لەناکاو بانگی مفەوەز وریای کرد:
– گەورەم، مەولوود مندالّباز خەبەری بوویەوە.. فەرموون!

ئەو عەسرە، یاسین، لەگەڵ کارۆخ و کامیاری دوو کوڕە مامەکەی، لە تازیەی ئیبۆی کوڕە تاقانەکەی عومەر پۆخچی هەستابوون، پشتیان لە مزگەوتی شێخی چۆلی، بەرەو ماڵەوە دەگەڕانەوە.. کاتێ گەیشتنە بەردەم چایخانەکەی «مام سەلیمی لاسووتای» دەنگی عەتابەیەکی سعد الحلی لەناو چایخانەکەوە دەهات. کارۆخ تەماشای عەسکەرە عارەبەکانی دەکرد: تاک تاک جووت جووت لەولاتریشەوە پۆل پۆل لە حەمامەکەی بەرامبەر چایخانەکەوە دەهاتنە دەرەوە و خۆیان دەکرد بەناو چایخانەکەدا (کارۆخ جارێکیان چووبووە ناو چایخانەکە قومێک ئاو بخواتەوە، بەبیریەتی «حمدیە صالح و بناتها» قژیان تا سەر سمتی خڕیان کراوە، سنگ و مەمک نیمچە ڕووت، لە تەلەڤزیۆنەکەوە، بەدیار فیکە و هەرای عەسکەرە عارەبەکانەوە، بەدەم گۆرانییەوە خۆیان بادەدا و سەمایان دەکرد. کارۆخ ئەو ڕۆژە زۆر حەزی دەکرد ئەویش بچێت قەیرێک تەماشای سەمای نیمچەڕووتی حمدیە صالح و کچەکانی بکات؛ بەڵام چەندی دەکرد نەیدەوێرا بە تاقی تەنیا لەناو ئەو هەموو عەسکەرە عارەبە حلالوی و بەصراوی و

ئەو نیوەڕۆیە، دوو کوڕە مامەکەی یووسف، کارۆخ و کامیار، لەگەڵ دوو هاوڕێی هاوتەمەنی خۆیان، لە باخچەکەی ماڵی یووسف دانیشتبوون. کارۆخ دەیگوت: من دڵنیام ئەمە کاری شێرۆ مەدفەعە.
کامیار دەیگوت: نەخێر، تاهیر تەسبیحە، چونکە ئەو هەرگیز وازی لە یووسف نەدەهێنا. هەمیشە بەدووایەوە بوو.
هاوڕێکەشیان دەیگوت: ئەدی جەمیل دۆخینی گەوواد؟!
هاوڕێکەی دیکەشیان دەیگوت:
– نەخێر. من پێم وایە پۆلیس هەڵەی نەکردووە.

صەحراوییە دابنیشێت!)؛ لەو دەمەدا یاسین پەنجەی بۆ ناو چایخانەکە درێژکرد و زنجیرەی خەیاڵی کارۆخی پچڕاند و گوتی:

– ئەمە «نەجۆ نازدارە»، جەماعەت!

کامیار گوتی: نەجۆ نازدار کێیە؟!

– قلی سەلیم ساڕووخ.

کارۆخ، تەمەنی سێزدە ساڵان بوو، گوتی:

– قل یەعنی چی، یاسین؟

– یەعنی وەک ئەوەی ببێتە ژنی.

کارۆخ یەکەم جار بوو شتی وا ببیسێت. کامیار ویستی باشتر ئەم نهێنییانەی لەلا ئاشنا بکات:

– قلەکەی جەمیل دۆخینیش ناوی «مەغە بێ مووە».

– مەغە بێ موو؟

یاسین پێکەنی، گوتی:

– ئەوەی تاهیر تەسبیحیش: «خەلیل خڕێ».

مام قادری قەیاغفرۆش گەواهیی دەدا:

سوێندم بەم بانگ و سەڵایە: مەلا چاو بە کلی فڕنیچی، لە دەروبەری کاتژمێر حەوت و نیوی بەیانییەوە لە ماڵی ئێمە بوو. من ئەمە دووەم جارە ئیفادە دەدەم. من خۆ ئەم بەیانییەش هەمان گەواهیم دایە مەفەوەز وریا... چۆن؟ چیی دەگوت؟! دەیگوت: «لەسەر قەبران گەڕاومەتەوە و ماندووم». بەڵێ؟ ئا، ڕاستە: کاتێ گەیشتە بەردەرگاکەمان هێنکەهێنکی پێ کەوتبوو، دەتگوت ڕاویان ناوە. چی؟! بۆ لەسەر قەبران بوو؟ ئێ ئاخر قەلەندەرەی، قوڕئانخوێنە. بەیانییەکی زووی ڕۆژی پێنجشەممە، مەلایەکی بەلەنگاز لەسەر قەبران چی دەکا جەنابی عەقید؟! قوڕئان لەسەر گۆڕی مردووان دەخوێنێ، بەستەزمانە! قابیلە چی دەکا! کەسابەتەکەی ئاوهایە ئیتر: هەموو بەیانی و ئێوارەیەکی پێنجشەمموان دەچێتە سەر قەبران، قوڕئان لەسەر گۆڕی مردووان دەخوێنێ، خەڵکی خاوەن مردووش خێرێکی پێ دەکەن. من ئەوا دووازدە ساڵە دەیناسم. ئەو فڕنییە بچکۆڵەیەشی هەیە لە تەیراوە. من دووازدە ساڵە «مەلا چاو بە کل» دەناسم، تا ئێستا هیچ قسەیەک یان کارێکی ناشیرینم لێی نەدیوە. چۆن؟ نەخێر.

ئەمە بوختانە پێی دەکەن.. هممم؟! هەر چۆنێک بێ. لە خۆی بپرسن. نەخێر، لە خۆی بپرسن، ئەو خۆی پێتان دەڵێ. بەڵێ ئا، من واتێدەگەم: «مەلا چاو بە کل» قسەی بۆ هەڵبەستراوە. دەنا پیاوێکی بەتەمەنی لەخۆگەڕاوەی دینداری وەک ئەو، هەرگیز تۆمەتی ئاوهای لێ ناوەشێتەوە، جەناب، ئێوەش ئەمە دەزانن. ئەم پیاوە سێ ساڵ زیاترە مەلایە، لەگەڵ فریشتان سەروکاری هەیە. چۆن؟ بەڵێ ڕاستە: قەیناکە مەلای مزگەوت نیە، بەڵام دەیان جار مەلا ئیزنیان داوەتێ بانگ بدا، قورئانخوێنە... مەلایەکی هێند دەستودامەن پاکە، دەیان مزگەوت مەمنوونیەتی پێشنوێژییان بۆ بکات. تەواو جەنابی عەقید، من گەواهیی خۆم دا. پرسیاری دیکەتان هەیە؟ بۆچی بەو بەیانییە زووە هاتبووە ماڵی ئێمە؟ ئەوەتا: من مسۆگەرم لەمەشدا هەر بوختانیان بۆی هەڵبەستووە. «مەلا چاو بە کل» هەموو بەیانییەکی پێنجشەمووان، کە لەسەر قەبران دەگەڕێتەوە، دێ سەرێک لە من دەدات و قاوڵتیی بەیانیم لەگەڵ دەکا. ژنی نەهێناوە، کەسی نیە، ئەگەر تەنانەت هەموو بەیانییەکیش هەر فراوینی خۆی لە ماڵی ئێمە بکا، چیی تێدایە؟ بەڵێ، زۆر

عەقید عەلی، گازاندەی لە مفەوەز وریا دەکرد:
– دەبووایە دەمودەست بتناردایەتە زیندانی سەرا!
– گـەورەم، جارێ هێشـتـا تەنانەت یـەک قـسـە ئیـفـادەیشـیـمـان لێی وەرنەگرتبـوو. جگە لەمـەش باوکی تەعەددالێکراو تەنیا شوبهەی لەسەر هەبوو و هیچی تر!
عەقید عەلی گوتی:
– ئەگەر تەنیا شوبهە بێت، بۆ ڕادەکا؟!
– خۆ من دەستی خۆمم بۆن نەکردبوو.
– هەر چۆنێک بێت، ئەم ڕاکــردنەی، لەســەری دەنووسرێت و حاکم حسێبی بۆ دەکات.
– دەبێتە بەڵگەیەک لەسەری.

«جـابیـر جـەنازە»، باوکی یووسف، پیـاوێکی درێژکۆڵەی لاوازی بێ هێـز بوو. لە سەری جادەکەی لای ماڵی خۆیان دوکانێکی بچکۆڵەی لێفەدروونی هەبوو. پیـاوێکی بەلەنگاز و سـادە و هەمـیـشـە بێدەنگ، خەڵک لەبارەیەوە دەیانگوت «مێشی لە دەمی خـۆی دەرناکـا». ئەو ڕۆژە، وەک شـێـتی لێ هاتبـوو، سـەری دنیـای لێ هاتبـووەوە یەک، بە یاسینی کـوڕە گەورەکەی خۆی دەگـوت: «هەر دەبێ بیــدۆزینەوە! بۆ کــوێ دەچێ!؟ قـــوڕ بەســەر ئەژدادیشی!».
جـابیـر جـەنازە ئەو ڕۆژە تەنانەت نەچووە نوێژی جـومـعـەش، هەر دەگـەڕا و لەگـەڵ یاسـینی کـوڕە گەورەکەی، سۆراغی مـەولوود منداڵبـازیان دەکـرد. یاسینیش زوو زوو بە باوکی دەگوت:
– دەبێ دەسـتی ئەوی تێدا بێ، بابە؛ دەنا بۆچی ڕادەکا!

برادەرمە و پیاوێکی باشە. هەموو نوێژێکی جومعان پێکەوە دەکـەین: هەندێ جـار دەچینە مـزگـەوتی کوێتی، هەندێ جاریش دەچینە مزگەوتەکەی حاجی مەغدید. ئەرێ وەڵا سەری بچێ، نوێژی ناچێ. من؟ بەڵێ بە ئەسڵ خەڵکی کەرکووکم. لەوێ عـەرزەمـان هەیە، دوکـانمان هەیە.. باوکم بەڕەحـمـەت بێ سێ خانووی گـەورەی بۆم جێ هێشـتبـوو، قـوربان؛ بەڵام ئیـتـر ئەمـە زرووفـە.. بە ناشکووری نەبێ، گـەلێک مەمنوونیشم. من دوو حەجم کردووە، قوربان.
مام قادری قەیماغفرۆش تفی لە دەم وشک ببوو، پرسی:
– بۆچی ئەم پرسیارە لە من دەکەی، گەورەم؟

ئەم پاش عـەسرە، بەڵقیس خانی دایکی یووسف، لەژێر دارمـێـوەکەی ناوەڕاسـتی حەوشەکەی خۆیان، تەسـبـیـحـێکی سـەد و یەک قل بەدەسـتـەوە، چارۆگـەیەکی سـپی بەسـەریەوە، دانیـشـتبـوو.. دەوراندەوریشی هەمـووی ژنی گـەڕەک و خـزمـەکـانی خۆی بوون: دایزە ویدادی ژنی بەدرەدین قـەرە، دادە نەزیـهـەی ژنی ئەحـمـەد خـۆخێ، پلکە بەدۆکـەی نانکەر، فـەخـری خـانی ژنی حـاجی جـەمـال دۆغرەمەچی، خا نیهایەتی ژنی عەونییە فەندی، ژنە ناوەنجییەکەی سەعید کوورەچی، ژنە گەورەکەی عوسمان سەقای ئامۆزای.. هەموویان، دەتگوت لە پرسـەیەک دانیـشـتـوون، دانیـشـتـبـوون و دڵیـان دەدایەوە.
ئامینەخانی ژنی عەبدۆک نەجار، دەستەخوشکی دێرینی بەڵقـیس خـان، تەنیـشـتی چەپی هەرگـیـز بەرنەدەدا. جگەرەکانی لالێـوی خۆیشی، یەک یەک بە عـەرزەکـەی بەردەم خـۆی دەکـوژاندەوە و پاشـان نەسـرینی خـوشکە بچکۆڵەکـەی یووسف جـارجـار دەست بە گسکێکەوە دەهات رایدەماڵین.
ئامینەخان چەندین جاری دیکەش، پێشتر، لەلای بەڵقیس خان باسی ئەوەی کردبوو کە چۆن عەبدۆک

ئەو ڕۆژەی مەولوود مندالّباز زیندانە بچووکەکەی مەخفەری تەیراوەی شکاندبوو و ڕایکردبوو، تەرمی پازدە «سەربازی شەهید» بە جارێک، لە سەنگەرەکانی عەبادان و قەسری شیرینەوە گەڕابوونەوە هەولێر: یەکێک لەوانە تەرمی کوڕە تاقانەکەی حاجی مورادی قاپقاپچی بوو کە تازە ژنیان بۆ گواستبۆوە! مەخفەری تەیراوە دەبووایە ناونیشانی خاوەن ئەو تەرمانە بدۆزێتەوە و پەیوەندی بە خاوەنەکانیان بکات. مەخفەری تەیراوە مەژغوول بوو. ئەو ڕۆژە هەرایەک بوو نەبێتەوە: هەولێر هەموو ڕژابووە بەردەم مەخفەری تەیراوە، هەر کەسێک وایدەزانی کوڕی خۆیەتی «شەهید کراوە» و تەرمەکەیان گەڕاندۆتەوە. عەقید عەلی دەیگوت:

– مەولوود مندالّباز ئەو دەرفەتەی ئەو ڕۆژەی قۆزتەوە و توانی ڕابکات.

یاسین بە باوکی گوت:

– مەفەوەز وریا دەلّێ: مەولوود مندالّباز ڕایکردووە بۆ مووسلّ.

باوکی یووسف گوتی:

– لە بنی دنیاش بێ، هەر دەیدۆزینەوە، کوڕم.

قادر قەیماغفرۆش بەپەلە خۆی گەیاندە زیندانی قشلّە، بەلاّم نەیتوانی بچێت سەردانی مەلا چاو بە کلی هاوڕێی بکات؛ پاسەوانەکان پێیان گوت: «تەنیا دووشەمووان مهاجە هەیە». بەپەلە نامەیەکی بۆ «مەلا» ناردە ژوورەوە:

«مەولوود مندالّباز لە ژووری زندانەکەی خۆی لە تەیراوە ڕایکردووە و پۆلیس بەدووایدا دەگەڕێن».

نەجاری مێردی، دەیان جار، نیوەشەوان یان بە چرقەی نیوەڕۆ، کوڕ و کالّ و مێردمندالاّنی هێناوەتە مالّەوە و بەبەر چاوی خۆیەوە ئیشی خراپی لەگەلّ کردوون.

ئەم پاش عەسرەش، دیسان، ئامینەخان (بەلاّم ئەم جارەیان بە چرپە و بەدزییەوە) سەری لە بن گوێچکەی بەلّقیس خان نابوو، سوێند و قورئانی دەخوارد کە عەبدۆک نەجاری مێردی، نیوەشەوان یان بە قرچەی نیوەڕۆ، چەندین جار کوڕ و کالّ و مندالاّنی هێناوەتە مالّەوە و بەبەر چاوی خۆیەوە لاقەی کردوون.

بەلّقیس خان، دیسان، بەدەم بیستنی ئەم قسانەی ئامینەخانەوە، لەبەر خۆیەوە تەسبیحاتی دەکرد و دەیگوت: «استغفر الله.. استغفرالله..».

ئامینەخانیش، لەژێر نێوچەوانی گرژ و داگرتووی خۆیەوە، لەناو ژنەکاندا، هەولّی دەدا وا دەری بخات کە گریانەکەی، بۆ یووسفی بەلّقیس خانە، نەک بۆ حالّی پەرێشانی خۆی.

عەبد گوڵباع، برای مەولوود منداڵباز، دوکانی چاکردنەوەی رادیۆ و تەلەڤزیۆنی هەبوو، گوتی:
– ڕاستە ئەو برای منە، بەڵام من لە ئەو بەرپرس نیم. بۆ خۆتان برۆن بیدۆزنەوە.
مفەوەز وریا لە عەبد گوڵباعی پرسی:
– چووە بۆ مووسڵ؟
– من نازانم لەکوێیە و چووە بۆ کوێ. خۆ لەگەڵ ئێمە ناژی!
مفەوەز وریا وای بە باش زانی سەردانێکی برا گەورەکەشیان بکات، سەعد، کە لە بانقی رافیدێن فەرمانبەر بوو.

یاسین ئەو شەوە، دووای ئەوەی میوان ماڵیان چۆڵ کرد، خزایە پاڵ باوکی و بەدەم گریانەوە بە باوکی گوت:
– بابە، من مەکتەب جێ دێڵم و چیتر دەوام ناکەم.
– بۆچی کوڕم؟
یاسین گریا:
– بابە، یووسف حەیای هەمووومانی برد.
باوک خەریک بوو بداتە پڕمەی گریان:
– نا، کوڕم، یووسف منداڵە.
– منداڵی چیە؟ حەیای هەمووومانی برد!
– خەڵکی گەورە حەیای ئێمەیان برد. خەڵکی گەورە شەرەفی ئێمەیان شکاند. یووسف منداڵە. تێگەیشتی!
باوکی یووسف لەنێوان تووڕەبوون و بەزەیی هاتنەوەدا لە یاسینی خوڕییەوە:
– جارێکی دیکەش گووی وا نەخۆیت!

«مەلا چاو بە کل» لەلایەن جابیر جەنازەی باوکی یووسفەوە شکایەتی لێ کرابوو. هەر لە کاتژمێر نۆی بەیانیی ڕۆژی پێنجشەممەوە، دووای سووکە تۆژینەوەیەک، لە پۆلیسخانەی تەیراوەوە ڕاپێچیان کردبووە حەپسخانەی سەرا.
مەلا چاو بە کل لە هەمووو ژیانیدا زیندانی نەدیبوو. ئەمڕۆ، لە ژوورێکی ئینفرادیدا دایاننابوو: چاوەڕێی ڕۆژی مەحکەمەی دەکرد.
مەلا چاو بە کل تەنیا خوشکێکی هەبوو: بەهییجەخانی ژنی ئەنوەر کۆترباز، لەگەڵ یەک تاقە برایشی، کاکۆ، کە جاران دوکانێکی تۆمارکردنی شریتی گۆرانی و ڤیدیۆی هەبوو.. لەسەر فرۆشتنی کاسێتی گۆرانییەکانی «شڤانپەروەر» موخبیرییان لێدابوو؛ ئەویش لەترسی ئیعدام، چەند مانگێک پێش ئێستا دابوویە شاخ و ببووە پێشمەرگە.
بەهیجەخان لەلای ماڵە خەزوورانی دەگریا:
– بەخوا، ماڵم قەبرە، مەغدیدی برام لەسەر کاکۆ گیراوە: چونکە ئشتەم کاکۆی برام موخبیرییان لێ دابوو، ئەویش ئشتەم چ بکا؟ بووە پێشمەرگە».

قادر قەیماغفرۆش خۆی گەیاندە لای جابیر جەنازەی باوکی یووسف:
– مام جابیر، تۆ پیاوێکی خواناسی، گوناحت دەگا ئابڕووی پیاوێکی دینداری وەکو «مەلا چاو بە کل» دەبەی!
مام جابیر بەم قسەیە زۆر تووڕە بوو:
– دەی، یاخوا نوخشە لە کوڕی تۆش بێ! هێشتا من حەیای خەڵک دەبەم..؟!
مام قادری قەیماغفرۆش، لەبیری چووبوو کە دەبووایە تەقدیری ئەوە بگرێ چ کارەساتێک بەسەر مام جابیردا هاتووە. هێورتر گوتی:
– مام جابیر، ئێستا کە ئەو مەولوودە خوێڕییە زندانی شکاندووە و ڕایکردووە، ئەمە بەڵگەیە بۆئەوەی بزانین تاوانبار کێیە!
جابیر جەنازە گوتی: «ئەگەر منیش داوا بکەم، حاکم خۆی بەری نادا».
– بۆچی؟
– چونکە تاوانەکە لەناو فرنییەکەی «مەلا چاو بە کل»دا ڕووی داوە.

خاڵی یووسف، قادر قیرۆ، بۆ خۆیشی کاتی خۆی منداڵباز بوو، بۆیە منداڵبازەکانی تەیراوە و تەعجیل و خانەقا و تەنانەت ئەوانەی گەڕەگی عارەبانیشی یەک یەک دەناسی؛
بە بەڵقیس خانی دایکی یووسفی گوت:
– بەڵقیس، خوشکی خۆم، غەمت نەبێ.. تۆ دەزانی: من بۆ خۆم لە خەتی مووسڵ ئیش دەکەم.. بەخوا لە ماوەی یەک هەفتەی داهاتوودا پەتی لە مل دەکەم و وەکو سەگ دەیهێنمەوە بەردەمت. هەر ئێستاش هەموو برادەرە شوفێرەکانی خۆم کە لە خەتی مووسڵ ئیش دەکەن، ئاگاداردەکەمەوە. بەڵێنیشت دەدەمێ ئەگەر مەولوود ئەم کارەی کردبێ، بەدەستی خۆم لە ناوەڕاستی شار بیکەم بە عیبرەت و هەلاهەلای بکەم.
دایکی کڵۆڵی یووسفیش هەر قژی خۆی دەڕنییەوە و دەلاڵایەوە:
– یووسف.. یووسفم ڕۆ! لە من ڕۆیی..

یاسین، نیوەشەو، خەونێکی ناخۆشی بینی:
کۆمەڵێک خوێری و تۆڕی و منداڵباز، بە هەموویان دەورەیان دابوو. سەلیم ساڕووخ، کە منداڵبازێکی گەڕەکەکەی خۆیان بوو، لێی هاتە پێشەوە و دەستی ڕاکێشا، لەناو منداڵباز و خوێرییەکاندا قوتاری کرد، ئنجا سواری پاسکیلێکی کرد و پێی گوت:
– بچۆرە چایخانەکەی عومەر پاڵەوان، ئێستا منیش دێمە ئەوێ. ڕاکە!
یاسین لەو دەمەدا یووسفی برای دەبینی هاواری دەکرد:
– یاسین، نەکەی، سواری پاسکیلەکەی سەلیم ساڕووخ نەبیت! فێڵت لێ دەکا، دەتبا! سواری پاسکیلەکەی نەبی! دەتبا! دەتبا ئەتکت دەکا! نەکەی سواری پاسکیلەکەی ببی!
یووسف لە خەونەکەی یاسینی برایدا هەر هاواری دەکرد و دەکڕووزایەوە..

نزاری کوڕە پارچەڵەکەی مام قادری قەیماغفرۆش کە برادەر و هاوزای یووسف بوو، ئەو شەوە خەونێکی ناخۆشی دیتبوو: جەمیل دۆخین و کەریم کەرگێ و تاهیر تەسبیح.. بە هەر سێکیان، لەناو بەستەکەی ژێر پردی سەیداوە، دەستیان گرتبوو، دەیانویست بیبەن. نزاریش هەر هاواری دەکرد و کەس نەدەگەیشتە فریای. مام قادری قەیماغفرۆش نیوەشەو لەگەڵ هاوار و لالانەوەی کوڕەکەی خۆی خەبەری بوویەوە:
– لا حول و لا قوە الا باللە..

ئەو نیوەڕۆیە، دوو کوڕە مامەکەی یووسف، کارۆخ و کامیار، تەمەن سێزدە و چواردە ساڵان، لەگەڵ دوو هاوڕێی هاوتەمەنی خۆیان، لە باخچەکەی ماڵی یووسف دانیشتبوون: هەر یەکەیان بە چرپە چیرۆکی خۆی بەدەست منداڵبازەکانی گەڕەکی خۆیان دەگێڕایەوە: سەلیم ساڕووخ، قادر قەنینە، کەریم کەرگێ، بیج حەسەن..

ڕۆژی دووشـەممە، پێنجـەمین ڕۆژ بوو کـە مـاڵ یووسفی تێدا نەبێت. ماڵەپلک و ماڵە مام و ماڵە خـاڵ و ژنانی دەرودراوسێ، پەیتـا پەیتـا دەهاتنە مـاڵی یووسف. لەناو ژنانیـشدا خەبەر بڵاوبـۆوە: «مـەولوود منداڵـباز» لەدەست پۆلیسـەکانی زیندان غـاری داوە و چووە بۆ مـووسڵ: پۆلیس لە هەمـوو شوێنێک بەدووایدا دەگەڕێن.
دایـکی یـووسـف، ئـەو ڕۆژە لـەنـاو ژنـانـدا هـەر دەلاّلایەوە:
– بەقـوربانی بم! یووسف جـوان بـوو. یووسف، جوانیی خۆی بوو کە سەری خوارد!

«ڕائیـد نەعـیـمی برا گـەورەی شـێـرۆ مـەدفـەع مەسئوول شوعبەی ئیستیخباراتی مەخموورە، تا ئێستـا سێ نۆط الشـجاعـەی قادسیـەی صدامی دراوەتێ و دەســـتی لەناو حکوومـــەتدا دەڕوا و پیاوێکی زاڵمە».
یاسین ئەم قسانەی لە دڵی خۆیدا بە خۆی دەگوت و دەترسا. دەترسا لەوەی کە ڕائید نەعیم (سەبارەت بەوەی کـە شێـرۆی برای لە سۆنگەی یووسفی برای ئەم گیـراوە) شەقاوە و شـەللاتییـەکـان هان بدات و ئەمـیـش تووشی چورتمێک بکات، یانیش خـۆ لە دەستی دێ بچێ باوکی بە گرتن بدات و بڵێ «ئەم عائیلەیە عائیدوونن یان پەیوەندییان بە پێشنەرگەوە هەیە..

– خـەڵکی هەولێـر، کـەس کچ و خـوشک و ژنی خۆی ناهێنێتە دەرەوە. ئیدی پیاو لەم شارەدا ناچار دەبێ عاشقی هاوجنسی خۆی بێ.
– استغفرالله.. یەعنی چۆن، دختۆر؟
– تۆ ئەمـســەر تا ئەوسـەری بازاڕی هەولێـر تەی دەکەی، ژنێک یان کچێک نابینی.
– ئێ..!؟
– ئەم شـارە گـەورەیە پـیـاوێکی تێـدا نیـە.. کـە ژنەکەی خۆی یان کچەکەی خۆی بنێرێتە دەرەوە یان هیچ نەبێ لەگەڵ خۆی بیانهێنێتە دەرەوە.
مام قادری قەیاغفرۆش گوتی:
– ئنجا ئەمە پەیوەندیی بە منداڵبازییەوە چیە؟
دکتۆر زەکەریای کوڕی ئەحمەدئاغای دۆغرەمەچی، کە تازە دکـتۆرای لە بواری نژداریی هەناو لە لەندەن هێنابۆوە و عـــیـــادەیەکی پزیشـکیی لە نزیک دەرمانخانەی شیمال کردبۆوە، بە مام قادری گوت:
– ئەم بەزمەی منداڵبازی، لە هەولێر، بەرەنجامی ئەم دابڕانەی جنسی نێر و مێیە لە یەکتری.
– چۆن؟
– کچ و کـوڕ ئەگـەر هەر لە منداڵـیـیـەوە بـتـوانن یەکـتـر ببـینن و چاویان بە یەکـتـر بکەوێ، یان هیچ

نیـوەڕۆیەکی گەرمی هاوین، یووسف دەسەسڕێکی تەنک بەسەر پشتەدەستییەوە، گەڕایەوە دەگریا.
یووسف لە دوکـانێکی ئوتووکـردندا شـاگـرد بوو «ئوتووی هەڵمی چواردەی تەمووز». ئەو نیـوەڕۆیە، وەســتـا ســتـاری ئوتووچی لە کـاتی ئیـشکردندا نەیزانیبوو دەستی یووسف لەسەر زەمینەی ئوتووەکە بووە، ئامێری ئوتووی هەڵمەکەی داگرتبووە خوارەوە و پشــتــەدەســتی یووسف یەکــســەر چزەی لێ هەستابوو.
ئەو ســووتانە، بەو ئوتووە گــەرمــە گــەورەیە، سەرلەبەری چەرم و پێستی پشتـەدەستی یووسفی داڕزاندبوو. ئەو نیوەڕۆیە، یووسف لە باوەش دایکی خۆی هەر دەگریا و دەلاّلایەوە.
– کوێرابیم دایە، ئێستـاش هەر ئەو ناڵینەی لە گوێچکەمدا دەزرنگێتەوە.
دایکی یووسف، لەو عەسرەی بێ یووسفیدا، ئەم پشـتـەدەست سووتانەی یووسفی بیرکەوتبۆوە، هەر شینی دەگێڕا و لە رووی خۆی دەدا: «بەقوربانی بم. لە کەس نەڕۆیی، بەخوا لە من ڕۆیی..

مەلای مزگەوتی شێخی چۆلی بانگی نیوەڕۆی دەدا. لە کەبابخانەکەی «خالید بیریژی»، مام قەرەی پینەدۆز، وەستا ئەسکەندەری بندیان، لەگەڵ مام بەکری بیرچی دانیشتبوون نانی نیوەڕۆیان دەخوارد. لە تەنیشتیشیانەوە، عەبد گوڵباغ، برای مەولوود منداڵباز، دانیشتبوو ئەویش نانی دەخوارد. گۆرانییەکەی فازڵ عەواد لە تەلەڤزیۆنە رەش و سپییەکەوە دادەڕژایە ناو تەقە تەقی قاپ و کەوچک و قسەکانیانەوە: « لا خەبەر لا چەفییە لا حامز حلوو لا شەربەت..
– مەولوود باش خۆی قوتار کرد، کاک عەبد!
– دەڵێن «رایکردووە بۆ مووسڵ»؟
– بەخوا، لە بنی دنیاش بێ، هەر دەیدۆزنەوە.
– باشە، ئەم برا بەدبەختەت بۆچی ئەم بەزمەی تەرک ناکا.. کاک عەبد؟
– چی لێبکەم؟ چەندی پێی دەڵێین. فایدەی نیە.
– جارێکیان گوتبووی «پیاو لە ژن بووە، چۆن دەبێ بە لای ژندا بچێتەوە؟»،
وەستا ئەسکەندەری بندیان گوتی:
– لا حول و لا قوە الا بالله...

ڕۆژی چوارشەممە، یاسینی برای یووسف، دیسان، لەناکاو، هەستی بە چاوشکاوییەکی توند دەکرد: ڕووی نەدەهات بچێتە مەکتەب. نەچووە مەکتەب: تا نیوەڕۆ لە چایخانەکەی مام عیدۆی ئەوبەری گەڕەکەکەی خۆیان، بەدیار سەما و گۆرانییەکانی «حمدیە صالح و بناتها» مایەوە.. نەشیدەزانی چی بکا!
جار بە جار، غەریب غەریب، غەمگینانە تەماشایەکی منداڵ و مێردمنداڵ و گەنجە دۆمینەچی و ئەزنیفچییەکانی دەوری خۆی دەکرد، پاشان بێهوودە، ڕووی دەکردەوە سەما و گۆرانییەکانی حمدیە صالح و بناتها..

نەبێ ئەگەر لە تەمەنی هەرزەکارییەوە بتوانن یەکتر بناسن، ئەوا کەڵکەڵە و هەوەس و ئارەزووی پیاو هیچ نەبێ کەمێک دادەمرکێتەوە و لە هەمان کاتدا پیاو ئەوکاتە باش باش لەوە تێدەگات کە کچ بە مەخلووقێکی جوانتر و شایستەتر بۆ خۆشەویستی بزانێت، لەچاو کوڕ.
مام قادری قەیماغفرۆش، سەری لەم قسانەی دکتۆر زەکەریای کوڕی «ئەحمەدئاغای دۆغرەمەچی» سوڕمابوو.

یووسف تەمەنی پازدە ساڵ بوو، جوانکیلە و هێمن و ژیر. جوانییەکەی لە دایکییەوە، هێمنییەکەی لە باوکییەوە، ژیرییەکەیشی لە سروشتی خۆیەوە بۆ مابۆوە.
سەبارەت بە نەداریی باوکی، یووسف ساڵێک درەنگتر لە تەمەنی خۆی چووە بەر مەکتەب. کاتی خۆی، دایک و باوکی هەر ئاگاشیان لێ نەبوو کە یووسف کاتی چوونە مەکتەبی هاتووە، قادر قیرۆی خاڵی دەستی گرت و بردی لە قوتابخانە قەیدی کرد.
یووسف تا ئەوکاتەی لە قوتابخانەش ناوی تۆمارکرا، هەر گوڵەبەڕۆژە و بنێشتی، بەسەر سنییەکەوە، لە شەقامەکان دەفرۆشت.
مام جابیری باوکی، حەزی نەدەکرد یووسف کار بکات، دەیگوت «هەتا ماوم دەبێ هەر بۆ خۆم بەخێویان بکەم»، بەڵام دایکی، دەیگوت «نەخێر، با کار بکات و فێری کاسبی ببێت».
یووسف کاتێ چووە بەر خوێندن، ئەوەی لە کۆڵ بووەوە کە لە بەیانییەوە تا ئێوارە کار بکات. خاڵۆکەی، بردی بۆ لای برادەرێکی زێڕنگەری خۆی، لە لای ئەو کردی بە شاگرد.

هەموو ئێوارەیەک، کاتێ دەگەڕایەوە ماڵ، دایکی دەستی لە ملی دەکرد و پێی دەگوت:

– کوڕم، پیاو نابێ دەستوپێ سپی دەربچێت! بۆ خۆت لای ئەم پیاوە زێڕنگەرە فێری زێڕنگەری دەبیت.

باوکیشی، بۆ گاڵتەپێکردن دەیگوت:

– ئا، ئا، کوڕم، هەر دوو ساڵی دیکەیە ئیدی دەبیت بە زێڕنگەرێک لە هەموو هەولێر تاک بێ! ئەرێ وەڵڵا، هەر دوو ساڵی دیکەیە، هەموو زەندی دایکت دەکەی بە بازنی عەیار بیست و یەک.

دایکیشی پێدەکەنی. بە یووسفی دەگوت:

– کوڕم گوێ مەدە باوکت، ئەو گاڵتەت لەگەڵ دەکا و حەزناکا هیچ کامێکتان کار بکەن!

– نەوەڵڵا نا کوڕم گوێ مەدە باوکت..

– بەخوا بزانە دەبێتە چتۆ زێڕنگەرێک!

هێشتا هەفتەیەک بەسەر کارەکەی یووسف تێنەپەڕیبوو، نیوەڕۆیەک وەستا جەردیسی زێڕنگەر، ژنێک هاتە دوکانەکەی. یووسف چاوی لێیان بوو: لەناو دوکانەکە کەوتنە پستە پستی نێوان خۆیان، یووسف لە قوولایی ناو دوکانەکە دانیشتبوو، نەیدەویست وای پیشان بدا ئاگای لەوانە، مەژوولی

تواندنەوە و لەحیمکردنی هەندێ پارچەزێڕ بوو.
لەناکاو، وەستا جەردیس بانگی کرد:
– یووسف! وەرە برۆ کیلۆیەک تەماتە بکڕە!
لە دەرەوە باران دەباری، یووسف بەبەر بارانەکەدا چووە ناو قەیسەری، کیلۆیەک تەماتەی کڕی و هاتەوە، دیتی: وەستا جەردیس و ژنەکە پێکەوە چوونەتە ناو قوولایی دوکانەکەوە و یەکتر هەڵدەپشێون.
– ئەمە کیلۆیەک تەماتە، وەستا!
وەستا جەردیس گوتی:
– چیە ئەوە؟ تۆ تەماتەت کڕیوە؟!
– ئەدی جەنابت نەتگوت «تەماتە»؟
– نەخێر، کوڕم، من گوتم «بیبەر»، بچۆ دەی، ڕاکە، کیلۆیەک بیبەر بکڕە!
لە دەرەوە باران دەباری. یووسف بەبەر بارانەکەدا دیسان گەڕایەوە ناو قەیسەری، کیلۆیەک بیبەری کڕی و هاتەوە. دیتی: دیسان وەستا جەردیس و ژنەکە، لە باوەش یەکتر، مەژوولی یەکتر بوون:
– فەرموو وەستا، کیلۆیەک بیبەر!
وەستا جەردیس دیسان خۆی لێی تووڕە کردەوە:
– چیە ئەوە تۆ بیبەرت کڕیوە، کەرە!

– ئەدی تۆ نەتگوت «کیلۆیەک بیبەر» ؟
– نەخێر، من گوتم: «دەسکێک توور و دەسکێک کەرەوز، کوڕی خۆم». زووبە، دەی..!
لە دەرەوە هێـــشـــتـــا هەر باران دەباری، یووسف دیسـان گـەڕایەوە ناو قـەیسـەری، دەسکێک توور و دەسکێک کەرەوزی کڕی و هاتەوە، دیتی: ئەم جارە دوکانەکەیان داخرابوو. دیار بوو وەستا جەردیس لە دیوی ژوورەوەڕا قـەپەنگی دوکـانەکەی ڕاکـێشـابووە خوارەوە.
یووسف لەو ڕۆژە باراناوییەدا تا ئێوارە هەر بیری لە وەستا جەردیس و ژنەکە دەکردەوە، پاشان لەناکاو حەزی کـرد چیـرۆکەکە بـۆ باوکی بگێڕێتـەوە. باوکی یووسف، دووای بیـسـتنی چیـرۆکـەکـە، دەمـودەست بڕیاری دا:
– جارێکی دیکە ناچیتەوە لای ئەم سەرسەرییە.
دایکی گوتی: بۆ؟
باوکی گوتی: بۆی بگێڕەوە!

ئیـتـر، لەو ڕۆژەوە، هەمـیـشـە، دایکی، لەڕێگای خـاڵۆکـەیەوە، یووسـفی دەبرد لە دوکـانێـک دەیکردە شـاگـرد، باوکـیــشی، بەپێـچـەوانەی ئەو، دووای

ماوەیەک، دەچوو لەو دوکانە دەری دەهێنا.
شەوێک، لەناو جێ، دایکی یووسف بە جابیری گوت: «ئەمە چیە: من هەر دەمەوێ ئەم منداڵە فێری پیشەیەک بێت، دایدەنێمە بەر کارێک و تۆ دووای هەفتەیەک دەچی دەریدەهێنی؟».
جابیر جەنازە پێش ئەوەی دوکانی لێفەدوورینەکەی بگوازێتەوە گەڕەکەکەی خۆیان لە تەیراوە، چەندین ساڵ بوو لەناو بازاڕی گەورە شاگردە پەڕەچی بوو. باش دەیزانی ناو بازاڕی گەورە و قەیسەری کێی تێدایە و چیی تێدا دەکرێ! یەک بە یەک قەساب و زێڕنگەر و بەقاڵ و کوتاڵفرۆش و کەبابچی و نەجارەکانی ناو قەیسەری و بازاڕی گەورەی دەناسی. بە بەلقیسی دایکی یووسفی گوت:
– بەلقیس، تۆ بیر لە شتێک دەکەیتەوە و من بیر لە شتێکی دیکە..
– تۆ بیر لە چی دەکەیتەوە؟
– من پیاوی ناو بازاڕم و باشتر لە تۆ ئەو پیاوە خوێڕی و تۆڕییانە دەناسم کە تۆ پێت وایە یووسف لەلایان فێری کەبابچێتی و نەجاڕی دەبێت!
– من دەڵێم بەڵکو دەستوپێ سپی دەرنەچێت و بۆ

خۆی فێری پیشەیەک ببێت!
جابیر جەنازە دەیزانی لەناو بازاڕ و چایخانە و کووچە و کۆڵانان ، بە ناوی شاگردییەوە چی بە منداڵ و مەزنان دەکرێت، گوتی:
– بەلْقیس، تۆ تەماشای بکە! یووسف (بە قوربانی بم) تۆ دیوتە: دەڵێی بووکەشووشەیە! دڵم نایێ لە هەموو جێیەک ببێتە شاگرد! تێگەیشتی!
– ئەدی چی بکا؟
جابیر بەتووڕەییەوە:
– یووسف جوانە.. جوانکیلەیە.
بەلْقیس جەختیی کردەوە:
– ئەدی هەر بە کۆڵاناندا بسووڕێتەوە؛ خوێڕی دەربچێ؟
– بۆ خوێڕی دەردەچێ؟
– منداڵ ئەگەر کارێک نەکا، ناچارە هەر بە کۆڵاناندا بسووڕێتەوە.
– با بێتە دوکان و بەردەستیی خۆم بکا.
– ئەدی یاسینت لەلا نیە؟
– با بە نۆرە بێن.
– دە کەواتە، با یووسف لەلای خۆت بێ و یاسین شاگردی بکات!

جابیر جەنازە، لەناو جێ، عادەتی بوو: کاتێ زۆر تووڕە بووایە، دەیگوت: «عەجەاایب!».
– دە باشە، دەی.
– یووسف جــوانە، بەڵقــیس. دڵم نایە لە هیچ شـوێنێک ببێتـە شاگرد و تەواو. کوڕەکەی حاجی وەهاب چەخماخچیت بە بیرە چیان پێ کردبوو؟
– پیـاوەکـە، دەی! خـۆت چۆنی بە باش دەزانی، ئەوە بکە!
– بە فـێڵی ئەوەی کە بیبـەن ئوتوومـبیلێکی پێ چاک بکەنەوە، بردبـوویانە ناو زوورگـــەکـــانی کەندێناوە، لەوێ تێر تێر ئیشی خۆیان لەگەڵ کردبوو و هێنابوویانەوە.. هەڕەشەی ئەوەشـیان لێ کـردبوو کە لەلای کـەس قسە نەکات دەنا دەیکوژن، تا وای لێهـات وردە وردە وەستا فـیتـەرەکەی خۆیشی پێی فـێر بـوو. تا لە کـۆتاییدا لەژێر وەسـتاکەی خـۆیدا گـیــرا و هەمــوو شـتـێکی بۆ پۆلیس و بۆ دایک و باوکی خۆیشی گێڕایەوە!
– وەیش، چ بێـزەوەریت، جابیر. دوور بێ یاخوا. خۆ کفرم نەکرد!
– دە بنوو، بنوو..!
– خەوم لێ ناکەوێ، جابیر.

برا گەورەکەی مەولوود مندالّباز، سەعد، لە بانقی ڕافـدێنی هەولێـر کـاری دەکـرد، پیـاوێکی شـیک، هەمیشە گولێکی زەردی لە یەخەی خۆی دەدا. لەناو فەرمانبەرەکانی ئەوێدا، ڕۆژێک تووڕە بوو گوتی:

– نیـوەی ئەم هەولێـرە منـدالّبـازن، کـەچی تەنیـا قسـە بەو برا بەسـتـەزمـانەی من دەڵێن.. دەیانەوێ تەنیا ئەو بگرن!

– نیوەی ئەم هەولێرە..!؟ کێ مندالّبازە؟!

برا گەورەکەی مەولوود مندالّباز گوتی:

– ئەبوو سـوفـیـانی باوکی مـعـاویەی یەکـەمین خـەلیـفـەی ئەمـەوییـەکـان مندالّبـاز نەبوو؟ ئەمـینی کـوڕی هارونە ڕەشـیـد؟ سـولّـتـان سـەنجـاری سەلجووقی.. ئەمانە هەموویان مندالّباز نەبوون؟!

الله وێردی، کە فەرمـانبەرێکی تورکمـانی بانقی ڕافـیـدێن بوو، بە چرپە، بە فەرمـانبـەرە برادەرەکـەی خۆی گوت:

– بێوگ قەرداشی، ئۆزدە جەمالسێوان دی!

مـام قـادری قـەیماغـفـرۆش جـارێکی دیکەش شـاگـردەکـەی خـۆی بانگ کـردەوە لای خـۆی. پێی گوت:

– وەرە دانیشە، ڕۆستەم.

– بەڵێ.

– تۆ، ئەو بەیانیـیـەی ڕۆژی پێنجـشـەممە، بە هەمووی پەنجا مەتر لە ڕووداوەکەوە دوور بوویت.

–ئێ؟!

– لە نووکەوە بۆم بگێڕەوە، چۆن بوو؟!

– گوێ بگرە، مام قادر!

– بەڵێ..

– تازە مـاست و قـەیماغ و شـیـر و سـەرتوومـان پێگەیشـتبوو، هێشـتا سەرفەتاحم نەکردبوو، یەک مـوشـتـەریش چیـە نەکـەوتبـووە سـەر جادە. گـەرد و گولّی بەیانی بوو، لەناکاو هەر هێندەم زانی ژنێکی عەبا بەسەر نەعرەتەیەکی کێشا و غاری دایە لای من، گوتی:

– وەیش، وەیش.. استغفرالله.

ئنجـا لەدووای ئەو کـوڕێکی گـەنج لەپێش فڕنییەکەی «مەلا چاو بە کل» هاواری کرد:

– پۆلیس، پۆلیس.. خەڵکینە!

– بەبیـرتە دەمگوت: «یووسف جـوانکیلەیە، با نەبێتە شاگرد!

– بەقـوربانی بم،. ئنجا خۆ لە کـاتی شاگـردیدا وای بەسـەر نەهات؟! من ناردم بۆ فـڕنی، بچێ سەموونم بۆ بکڕێ (هەی بە قوزەڵقورتم بێ!). ناردم سەموونم بۆ بکڕێ.. نەگەڕایەوە..

بەڵقـیس خـان دەسـتی کـردەوە گریانی شـەوانەی خۆی..

کاتێ گەیشتمە بەر دەرگای فڕنییەکە، دەرگای ژوورەوەی دادرابۆوە. کوڕە گەنجەکە گوتی:

– لە ژوورەوەن، لە ژوورەوە..

– کێ؟

– پیاوێکە.. سواری منداڵێک بووە.

گوتم: چیی لێ دەکا؟!

گوتی: چی.. چیی لێ دەکا؟! من بە چاوی خۆم دیم. ژنەکەش دیتیانی، بۆیە ئەو غاری دایە لای تۆ و هاواری کرد: استغفرالله..

مام قادری قەیاغفرۆش لێی پرسی:

– منداڵەکە کراس و بێجامەیەکی خەتخەتی نارنجیی لەبەر بوو؟

– دەیگوت: «بێجامەکەیم باش نەدیت، چونکە بێجامەکەی هێنابووە خوارێ، بەڵام کراسێکی سپیی لەبەر بوو».

مام قادری قەیاغفرۆش پرسی:

– ئەو ژنە، منداڵەکەی دەناسی؟!

– دەیگوت: «بیشیبینمەوە نایناسمەوە. ژوورەوە تاریک بوو. نەمتوانی باش بیانبینم کێن؟! بەڵام دەنگیان دەهات، دیتیشمن: پیاوێک بوو بەسەر منداڵێکەوە..». لێم پرسی:

قادر قیرۆ، خالی یووسف، بیست دیناری دایە حەمید حەرِبە، کە شەللاتییەکی ناو گەراجی تەیراوە بوو (سالانێکی زۆر بوو برادەر بوون): بۆئەوەی بچێتە مووسڵ و هەفتەیەک بەدووای مەولوود منداڵبازدا بگەرِێ.

– نەتدەزانی پیاوەکە کێیە؟ کەسێکی چۆنە؟
– نەمدەتوانی پیاوەکە بناسمەوە، بەڵام منداڵەکە دیاربوو جوانکیلەیەکی مووزەرد بوو.
– مووزەرد بوو؟
– بەڵێ.
مام قادر گوتی:
– ئەو وەسفەی ئەو کورە گەنجە کردوویەتی، بە هیچ شێوەیەک پێ ناچێ کە ئەو منداڵە یووسفی جابیر جەنازە بێ!
– چۆن؟!
– کورەکەی مام جابیر مووزەرد نیە. جگە لەمەش، ئەو، مام جابیر و دایکی دەڵێن «کراس و بێجامەیەکی نارنجیی خەتخەتی لەبەر بووە».
– نەخێر، ئەو دەیگوت: «ئەو کورەی من بینیم، مووزەرد بوو، کراسێکی سپیی لەبەر بوو».
مام قادر لە رِۆستەمی شاگردی خۆی پرسی:
– ئێ.. پاشان...؟
– پاشان ئیتر، ئەوە بوو: وردە وردە خەڵک لەبەردەم فرِنییەکەدا کۆبوونەوە و پۆلیس هات، چوونە ژوورەوە.. کەسی لێ نەمابوو.
– کەسی لێ نەمابوو؟!

- کەسی لێ نەمابوو.
- چۆن؟!
- نازانم.
- پێشتر تۆ خۆت منداڵەکە و پیاوەکەت لە ژوورەوە بینی؟!
- من نەمدین، کوڕە گەنجەکە و ژنەکە بینیبوونیان.
- ئەدی باشە، پیاوەکە و منداڵەکە چیان لێ هات؟
- نازانم.
- چۆن؟
- پۆلیس هاتن سەروخواری ناو فڕنییەکە گەڕان، نەیاندۆزینەوە. پۆلیسەکان دەیانگوت: بەسەربانەوە غاریان داوە.
- ئا.. ها! سەربانەوسەربان غاریان داوە.
- بەڵێ. هەتا من گەیشتمە بەردەم فڕنییەکە، هیچ کامێکیان لەوێ نەمابوون.
مام قادر، لەناکاو، لە ڕۆستەمی شاگردی خۆی پرسی:
- باشە، ڕۆستەم، تۆ ئەو بەیانییە مەلا چاو بە کلت دیت فڕنییەکەی خۆی بکاتەوە؟

یاسین بە باوکی گوت: «خاڵە قادر بیست دیناری داوەتە برادەرێکی خۆی: بۆئەوەی بچێتە مووسڵ بەدووای مەولوود منداڵبازدا بگەڕێ.

– نەخێر.
– ئەدی کێ هات فڕنییەکەی کردەوە؟
ڕۆستەم گوتی:
– هەموو بەیانییەک کاتێ من دێم قەپەنگی دوکانەکەی خۆمان هەڵدەدەمەوە، فڕنییەکە دەمێکە کراوەتەوە و کەوتۆتە گڕەگڕ. نازانم کێ دێ هەموو بەیانییەک دەیکاتەوە.
مام قادر گوتی:
– لەو دەمەدا پۆلیس چییان گوت؟
– سۆراغی خاوەنی فڕنییەکەیان دەکرد.
– «مەلا چاو بە کل» ؟!
– بەڵێ.
– چییان دەگوت؟
– دەیانگوت «لەکوێیە؟ دەبێ بیدۆزینەوە!» .
– ئەدی پاشان؟
– کاتێ زانییان کە «مەلا چاو بە کل» خاوەنی فڕنییەکەیە، گوێم لێ بوو یەکێکیان گوتی «لەوانەیە دەستی شاگردەکانی لەم کارەدا هەبێ» .
– ئەدی خەڵکەکە چییان دەگوت؟
– ئەوانیش هەر ڕایان وابوو کە یەکێک لە شاگردەکان بووە.

مام قادر گوتی:
- پۆلیس نەچوونە سەربان؟
- با. ئەو بەیانییە تا نیوەڕۆ، دوو جاری دیکەش پۆلیس هاتنەوە. چوونە ســـەربانیش. دیار بوو شوێنپێیان هەڵدەگرتن.
مام قادر پرسی:
- کوڕە گەنجەکە کێ بوو؟
- کام کوڕی گەنج؟
- ئەوەی لەپێش فڕنییەکە ڕووداوەکەی دیبوو.
- دەیانگوت «کـوڕی مـعـاون مـوفـیـدە» ئەوەی توولەسەگەکەی لە ماڵەوە ڕاگرتووە.
- ئەویشیان برد؟
- کێ؟
- کوڕە گەنجەکەی معاون موفید؟
- بەڵێ، بردیان. گـوتـیـان «ئـیـفـادەمـان بۆ بدە». ناونیشانی ژنەکەشیان وەرگرت و گوتیان «پاشان دێینەوە بە شوێن تۆدا».
- هیچیان لە تۆ نەپرسی؟
- با.
- گوتت چی؟
- چیم بۆ تۆ گـێـڕایەوە، ئەمـەشم بۆ ئەوان باس

برا گەورەکەی مەولوود مندالّباز، عەبد گولّباع، ئەو ئێوارەیە، لە نادی مهەندسین لەسەر قومارکردن بوو، بەپەلە نامەیەکی بۆ مەولوودی برای نووسی و دایە دەست مامۆستامورسەلی برادەری خۆی کە بۆ سبەینێ دەچووە پرسەی خزمێکی خۆی، کە لە قادسیەی صدامدا «شەهید» ببوو و تەرمەکەی گەڕابۆوە مووسڵ. عەبد گولّباع لە نامەکەیدا داوای لە مەولوودی برای کردبوو کە بەهیچ شێوەیەک لە مووسڵ نەمێنێتەوە و بچێت بۆ بەغدا: چونکە پۆلیس ئێستا پێیان زانیوە کە ئەو لە مووسڵە و.. بەدووایدا دەگەڕێن.

یاسین ئێوارە بە باوکی خۆی گوت:
– بابە، تۆ دەزانی: برا گەورەکەی شێرۆ مەدفەع لە ئیستخباراتە.
– بەڵێ.
– دەڵێن مەسئوول شوعبەی ئەمنی مەخموورە.
– دەزانم. گەوادێکی بەعسیی خوێڕییە. ڕائید نەعیم مووسڵاوی. چیی گوتووە؟
– گوتوویەتی «ئەگەر مام جابیر شێرۆی برام بەرنەدات، کارێک دەکەم کوڕەکەی دیکەیشی بە هەمان دەرد ببەن».
– ڕائید نەعیم ئەمەی گوتووە؟!
– بەڵێ.
مام جابیر گوتی:
– با گوو بخوا بۆ خۆی.

کرد.
– تۆ هیچی دیکەت نەدیت؟
– وەکو چی؟
– مەلا چاو بە کل؟!
– کاتژمێر دەوروبەری شەش و نیو دەبوو. پۆلیسەکان ڕاپێچیان کردم بۆئەوەی ماڵەکەیان پیشان بدەم. لەگەڵ پۆلیسەکان چووم بۆ ماڵیان.
– لە ماڵەوە نەبوو؟
– ژنە دراوسێکە دەیگوت: «ئەمڕۆ پێنجشەممەیە، بۆ قورئانخوێندن چۆتە سەرقەبران».

مام جابیری باوکی یووسف بە عەقید عەلیی گوت:
– من بۆ خۆم دەچمە مووسڵ بەدووایدا دەگەڕێم.
– چۆن؟
– خۆم و یاسینی کوڕم دەچین.
عەقید عەلی کەوتە ئامۆژگاریی مام جابیر:
– نەخێر. ئەمە ئیشی خۆمانە. لەم ڕۆژانە دەیدۆزینەوە. غەمتان نەبێ!
– نەخێر.
– چۆن؟
– مەولوود مندالّباز ئەو پیاوە نیە کە ئێمە بۆ خۆمان نەتوانین بیدۆزینەوە.

باوکی یووسف، به قادر قیرۆی خاڵی یووسفی گوت:
– منیش پارەم دایە سەمیری کوڕی مام خەلیفەی دراوسێمان، بچێتە مووسڵ و بەدووایدا بگەڕێ!
قادر قیرۆ گوتی:
– چاکت کرد! خۆمان نەیدۆزینەوە، پۆلیس هیچمان بۆ ناکا.

یاسین لە تیپی «سەبعە نیسان»ی گەڕەکی تەیراوە یاریکەری فوتبۆلێن بوو، فانیلەی ژمارە (٨)ی لەبەردەکرد و هەمیشە لە «شوبە یەمین» گەمەی دەکرد. هەمزە کەنناس سەرۆکی تیپەکەیان بوو، ئاگاداری مەسەلەی یووسفی برای بوو.. ئەو رۆژە لەناو چایخانەکەی مام خدر خمچی، کە بارەگای تیپی سەبعە نیسانی لێ راخرابوو، دڵی دەدایەوە:
– یاسین، کوڕی خۆم، ئیشاڵڵا ئیتر یووسفی برات لەم رۆژانە دەدۆزرێتەوە.. تۆش ئیدی وەرەوە و دەست بکەوە تەدریبی خۆت.
یاسین، چاوشکاو، بەڵام بێ ئەوەی بهێڵێ ئەم چاوشکاوییەی خۆی وەدیاربخات، گوتی:
– نایەم. چیتر نایەمە تەدریب، کاک هەمزە.
– بۆچی؟
– واز لە تۆپانێ دێنم.
– بەیەکجاری؟
– بەڵێ.
– بۆچی؟
– تۆپانێم تەرک کرد. تەواو.
– بۆچی؟
– مەژغوولم. باوکم بەتەنیایە و دەبێ لەگەڵی بم.

مام قادری قەیاغفرۆش، لەسەر خوانی بەیانیدا، بە ژنەکەی خۆی گوت:
– جابیر جەنازە، ئەمن و ئیستیخباراتی بەعس کوڕەکەیان ڕفاندووە. من دڵنیام.
– ئەیەڕۆ، بەڕاستتە؟!
– قورمساغەی، ناوێرێ بڵێ «ئێوەی بەعس کوڕەکەی منتان ڕفاندووە»، دەیەوێ تاوانەکە بخاتە ئەستۆی مەلا چاو بەکلی قەلەندەر.
مام قادری قەیاغفرۆش خۆیشی لای ژنەکەی خۆی نەبووایە، لای کەسی دیکە نەیدەوێرا ئەم قسەیە بکا.

یاسین، نیوەشەو، خەونێکی ناخۆشی بینی:
دیسان کۆمەڵێک خوێڕی و تۆڕی و منداڵباز، بە هەموویان دەورەیان دابوو. ئەم جارەیان تاهیر تەسبیح، کە منداڵبازێکی گەڕەکەکەی خۆیان بوو، لێی هاتە پێشەوە و دەستی ڕاکێشا، لەناو منداڵباز و خوێڕییەکاندا قوتاری کرد، ئنجا سواری پاسکیلێکی کرد و پێی گوت:
– بچۆ چایخانەکەی عومەر پاڵەوان، ئێستا منیش دێمە ئەوێ. ڕاکە!
یاسین لەو دەمەدا یووسفی برای خۆی دەبینی هاواری دەکرد:
– یاسین، نەکەی سواری پاسکیلەکەی تاهیر تەسبیح بیت! فێڵت لێ دەکا، دەتبا! سواری پاسکیلەکەی نەبی! دەتبا! دەتبا ئەتکت دەکا! نەکەی سواری پاسکیلەکەی ببی!

حەمید حەربە، شەللاتییەکەی برادەری قادر قیرۆی خالی یووسف، تازە لە مووسڵ گەڕابۆوە. لەناو گەراجی تەیراوە، هێشتا نەگەیشتبوونە ناو چایخانەکە، لە بەردەرگای چایخانەکە بە قادر قیرۆی گوت:
– کوشتوویانە.
– کێیان کوشتووە؟!
– مەولوود منداڵبازیان کوشتووە.
– کێ کوشتوویەتی؟
– نازانم.
قادر قیرۆی خالی یووسف لێی پرسی:
– ئەمڕۆ گەڕایتەوە؟
– هەر ئەمڕۆش بیستم. گوتم: «بەڵکو زوو ئاگادارتان بکەمەوە».
قادر قیرۆ ماوەیەک داما، پاشان لە دڵی خۆیدا گوتی: «تۆ بڵێی دەستی مام جابیری تێدا نەبێ!؟».

– بەڕاستتە؟
– بەڵێ، چونکە لە دوکان، بەتایبەتی لەم ماوەیەدا زۆر پێویستی بە من هەیە.
یاسین ڕۆیشت. کاتێ پشتی کردە بارەگای تیپەکەی، قولپی گریانێکی بەخوڕ خەریک بوو قوڕگی دابگرێ: چونکە دەیزانی کە جارێکی دیکە ناتوانێ «فانیلە ژمارە هەشتەکەی جارانی» بکاتەوە بەر. هەستی دەکرد ئەمە ماڵئاوایی کردنە لە هەموو ئاوات و ئارەزوویەکی ئەم هەڕەتەی ژیانی خۆی. حەیف!
یاسین دەرۆیشت و بەبێ فرمێسک هۆن هۆن دەگریا. خۆ بە هەمان شێوە یووسفی برایشی، هەر سەبارەت بە خۆڕی و تۆڕی و منداڵبازان بوو کە نەیتوانی – تا ئاخرین ڕۆژیش – فێری مەلەکردن ببێت! فێری زۆر شتی پێویست و جوانی دیکەش..

مام قادری قەیاغفرۆش بە ڕۆستەمی شاگردی خۆی گوت:
– دەستی مام جابیری تێدایە.
– بۆ دەیکوژێ؟!
– چۆن بۆ دەیکوژێ؟ بۆئەوەی حەیای خۆی بکڕێتەوە، کوڕم.
– ئنجا کێ دەڵێ کە مەولوود منداڵباز ئەتکەکەی کردووە؟
– ئەدی بۆ غاری دا؟ بۆچی کوژرا؟!
– کەواتە «مەلا چاو بە کل»یان بۆ گرتووە؟
مام قادری قەیاغفرۆش گوتی:
– لەبەرئەوەی تاوانەکە لەناو فرنییەکەی ئەودا رووی داوە.
– ئەمە مانای وایە کە مەولوود منداڵباز لەناو فرنییەکەی مەلا کارەکەی کردووە!
مام قادری قەیاغفرۆش داما، گوتی:
– ئاخر منیش ئەمەم بەلاوە سەیرە: مەولوود منداڵباز لەناو فرنییەکەی «مەلا چاو بە کل»ی قوربەسەر چی دەکا بەم سەعات شەشی بەیانییە!؟
ئنجا پاشان گوتی: جێ نەبوو ئەوێندەر نەبێ؟!
ڕۆستەم گوتی:

سەمیری کوڕی مام خەلیفەی شەربەتفرۆش، لە ماڵی مام جابیر جەنازەی باوکی یووسف دانیشتبوو، هەر چاوەڕێی مام جابیری دەکرد. نەهاتەوە. لە کۆتاییدا، تەحەمولی نەما، بە دایکی یووسفی گوت:
– پلکە بەڵقیس چیت لێ بشارمەوە!
– بۆچی؟
– بە مام جابیر بڵێ: مەولوود منداڵباز کوژراوە.
– ئەیەڕۆ، چۆن؟! کێ کوشتویەتی؟
– نازانم. لە مووسڵ کوشتوویانە. ئەوەندەی پێ بڵێ!
سەمیری کوڕی مام خەلیفە کە گەیشتە لای دەرگا، گوتی:
– بە باوکی یووسف بڵێ کە ئەمڕۆ تازە لە مووسڵ گەڕاومەتەوە.
کاتێ سەمیری مام خەلیفە دەرگای داخست، دایکی یووسف کەمێک داما، پاشان بە ترسێکەوە لە دڵی خۆیدا گوتی: «تۆ بڵێی دەستی جابیری تێدا نەبێ!».

– باوەڕ ناکەم.
– باوەڕ بە چی ناکەی؟
ڕۆستەم پێکەنی، گوتی:
– باوەڕ بە دوو شت ناکەم.
– یەکەم؟
– کە باوکی یووسف بچێ مەولوود منداڵباز بکوژێت.
– بۆ؟
– چونکە باوکی یووسف باوەڕی وایە کە «مەلا چاو بە کل» کارەکەی کردووە.
– لای تۆ وا دەڵێ؟
– دووەم شتیش: مەولوود منداڵباز چۆن بەبێ ئیزنی خاوەن فڕن منداڵ دەهێنێتە ناو فڕنەوە بۆ کارێکی ئاوها؟!
مام قادر لە ڕۆستەم تووڕە بوو:
– هەتیو، یەعنی تۆ پێت وایە کە دەستی مەلاش لە کارەکەدا هەیە؟!
– نا، استغفرالله.. بەڵام منیش لەوە تێ ناگەم: مەلا چاو بە کل چۆن ئاگای لەوە نەبووە کە کاتژمێر شەشی بەیانی منداڵبازێک بێت لەناو فڕنییەکەی، خۆی بۆ منداڵی خەڵک دانووسێنێت و ئەتکی

یاسین، ئەو ئێوارەیە، بە بەردەم حەمام مووردا دەگەڕایەوە ماڵ، لەناکاو دیسان چاوی بە عەریف عیسا کەوت. بەڵام ئەم جارەیان، یاسین لە بەردەم حەمامەکەدا کەمێک ترسا: چونکە تەنیا بوون و کەمێکیش دنیا تاریک داهاتبوو:

ئەم عەریف عیسایە ئێواران لە بەردەم حەمامەکاندا ڕادەوەستێت و چاو دەگێڕێ. یاسین باش دەزانێ: منداڵبازە و پیاویش دەخاتە سەر خۆی. زۆر سەیرە!

یاسین لە دڵی خۆیدا گوتی: «عەریف عیسایەکی منداڵباز لە پۆلیسخانە بێت و لە مەسەلەی برای من بکۆڵێتەوە؟!».

یاسین پێی سەیر بوو: پۆلیس خۆی منداڵباز و دوودەرکی بێت!

پۆلیسێکی منداڵبازی دوودەرکی،بۆ خۆی لەناو مەخفەری پۆلیس، دۆسیەی منداڵە ئەتک کراوەکان لە ژوورێکەوە بباتە ژوورێکی تر، تەنانەت لەوانەیە سەرپەرشتیی حوکمدان بەسەر تاوانەکەشدا بکات. زۆر سەیرە!

جابیر جەنازە چووەوە لای مەریوانی کوڕی معاون موفید، ئەو کوڕە گەنجەی کە لەگەڵ نەجیبەخانی مام هادی پەڕەشووت، لەبەردەم فڕنییەکەی «مەلا چاو بە کل»، تاقە دوو کەسێک بوون یەکەم جار و پێش هەموو کەسێک بەسەر ڕووداوەکەدا چووبوون و هەموو شتێکیان دیبوو.

مام جابیر ڕووی لە مەریوانی معاون موفید کرد:

– کوڕم، من دەزانم پۆلیس ئیفادەیان لێت وەرگرتووە و ئەوەی دیوتە لای پۆلیس باست کردووە. بەڵام ئەو بەیانییەی ڕۆژی پێنجشەممە، تۆ لە نزیک ڕووداوەکەوە بوویت. تکات لێدەکەم، مەریوان گیان، لە نووکەوە بۆم بگێڕەوە، چۆن بوو؟!

– گوێ بگرە، مام جابیر!

– بەڵێ..

– من بێجامەم لەبەر کرد و لە ماڵ دەرهاتم بچم سەموون بکڕم. ئەو بەیانییە، من یەکەم کەس بووم گەیشتمە بەردەم فڕنییەکە. یەکسەر لەدووای منەوە بە چەند دەقیقەیەک ژنێک هات: ژنی مام هادی پەڕەشووتی دراوسێی خۆتان. ئێمە هەردووکمان، من و خێزانەکەی مام هادی، لەبەردەم فڕنییەکە ڕاوەستابووین بۆئەوەی قەپەنگی فڕنییەکە بکات؟!

مام قادر لەناکاو پرسی:

– شاگردەکەی «مەلا چاو بە کل» ئیفادەی چیی داوە؟

– دوێنێ ئەویشیان گرتووە؟

– نازانی ئیفادەی چیی داوە؟!

– ئاگام لێ نیە.

ئەم پاش عەسرە، بەڵقیس خانی دایکی یووسف، لەژێر دارمێوەکەی ناوەڕاستی حەوشەکەیان، چارۆگەیەکی سپی بەسەریەوە، تەسبیحێکی سەد و یەک قلی بەدەستەوە، دانیشتبوو.. دەوراندەوریشی هەمووی ژنی گەڕەک: سەفیەت خانی مام خەلیفەی شەربەتفرۆش، دایزە ویدادی ژنی مەلۆ خەنجەرچی، ئامینە دوندوک سۆری ناتری حەمام شیفا، لەگەڵ ئەبلە سەمیرەی ژنی کاکل بنجووی دراوسێیان.. هەموویان، دەتگوت لە پرسەیەک دانیشتوون، دانیشتبوون و دڵیان دەدایەوە.

بەڵقیس خان، دەستی چەپی لەسەر ئەژنۆی جەیرانی خوشکی گەورەی، بە دەستی ڕاستیشی لە چۆکی خۆی دەدا و دەڵاڵایەوە:

– ویش.. باشە، هەر هیچ نەبێ: بگەڕێتەوە! هیچ نەبێ بیگەڕێننەوە! یووسفی من لەکوێیە، خوایە؟ لە چاوان کوێر بم..

هەڵبـــدەنەوە و ســـەمـــوونمان بدەنێ، لەناکـــاو دەنگەدەنگێکمـان لە ژوورەوە بیـست. ژنەکـە تەریق بۆوە، گــوتی «ئەیەڕۆ»، پاشــان هەر خــۆیشی، دانەوییـەوە و لەژێر قـەپەنگەکـەوە تەمـاشـایەکی ژوورەوەی کـــرد. لەناکـــاو هەر هێندەم زانی ئەم جارەیان ژنەکە نەعرەتەیەکی کێشا و بە استغفرالله استغفرالله غاری دایە سەر جادەکە!

منیش دووای ئەو بە هەمان شێوە تەماشایەکی ژێر قـەپەنگی فـڕنییـەکـەم کرد، دیتم: پیـاوێک سـواری منداڵێک بووە و.. تەواو. ئیـــدی ویســـتم بچم قەپەنگی دوکانەکە هەڵبدەمەوە. کاتێ قەپەنگەکەم هەڵدایەوە، ئەوان یەکسەر غاریاندا.

– غاریان دایە کوێ؟

– غـــاریان دایە ســـەرەوە. بە قـــاڵدرمـــەکـــەدا سەرکەوتن.

– ئێ.. پاشان؟

– چوومــە سـەر جـادەکـە، هاوارم کـرد: پۆلیس، پۆلیس.. خەڵکینە!

کـــاک ڕۆســـتـــەمی شـــاگـــردەکـــەی مـــام قـــادری قەیماغفـرۆش یەکەمین کەس بوو بەتەنگمەوە هات. بەڵام کـاتێ ئەو گەیشـتـە بەر دەرگـای فـڕنییـەکـە،

ئەوان ڕۆیشتبوون. کاک ڕۆستەم فریا نەکەوت هیچ ببینێ. بەڵام من بە چاوی خۆم هەموو شتێکم دیت. ژنەش دیتیانی، بۆیە ئەو غاری دایە لای کاک ڕۆستەم و هاواری کرد.

مام جابیر لە مەریوانی پرسی:

– منداڵەکە کراس و بێجامەیەکی خەتخەتی نارنجیی لەبەر بوو؟

– نەخێر،کراسێکی سپیی لەبەر بوو.

مام جابیر پرسی:

– کوڕی خۆم.. باشە، تۆ یووسفی کوڕی منت نەدەناسی؟! ئایا ئەوەی تۆ دیتت کوڕی من بوو؟ ئاخۆ بە یووسفی کوڕی من دەچوو؟

– نازانم. من ئەو منداڵە بشبینمەوە نایناسمەوە. ژوورەوە تاریک بوو. نەمتوانی باش بیانبینم؛ بەڵام کراسێکی سپیی لەبەردابوو، نەک نارنجیی خەتخەت.

– نەتدەزانی پیاوەکە کێیە؟ کەسێکی چۆنە؟

– نەمدەتوانی پیاوەکە بناسمەوە، بەڵام منداڵەکە دیاربوو جوانکیلەیەکی مووزەرد بوو.

– مووزەرد بوو؟

– بەڵێ.

- کـــورِم، ئەو وەســـفـــەی تۆ دەیکەی، بە هیچ شێوەیەک پێ ناچێ ئەو منداڵە یووسفی من بێ!
- منیش، لە ئیفادەکەی خۆمدا، هەرگیز نەموتووە یووسفی کوڕی تۆم دیوە. من شتی وام نەگوتووە.
- یووسفی کوڕی من مووزەرد نیە، جگە لەمەش، ئەو بەیانییــە، یووسف کـراس و بێـجـامـەیەکی نارنجیی خەتخەتی لەبەر بووە.
- نەخـێـر، ئەو کـوڕەی مـن بینیم، مـووزەرد بوو، کراسێکی سپیی لەبەر بوو.
مـەریوانی کـوڕی مـعـاون مـوفـید بە مـام جـابیـری گوت:
- ئێـوە خـۆتـان لای پۆلیس گـوتووتانە کـە ئەمـە کوڕەکەی ئێوەیە. من نەمگوتووە.
مام جابیر پرسی:
- باشە، کاک مەریوان، تۆ ئەو بەیانییە، یووسفی کـوڕی منت لە هیـچ شـوێنێک لەو ناوە یان لەسـەر جادەکەی دەرەوە نەدیت؟
- گوێ بگرە، مام جابیر: من یەکەمین کەس بووم گەیشتمە بەردەم فڕنییەکە. کەسم لەوناوە نەدیت، تەنیـا مــەگــەر یووسف پێش من هاتبـێت و من نەمــدیبێ! بێگومـــان من هیـــوادارم ئەو نەبێت.

باوەڕیش ناکەم ئەو بێت.
– ئەدی ئەگەر ئەو نەبێت، کوڕی من کوا؟ بۆ نەهاتەوە؟
مەریوانی کوڕی معاون موفید تەماشای خەفەتی سەر ڕوخساری مام جابیری دەکرد، گوتی:
– هەرکە ئیتر وردە وردە خەڵک لەبەردەم فڕنییەکەدا کۆبوونەوە و پۆلیس هات، چوونە ژوورەوە.. ناو فڕنییەکە کەسی لێ نەمابوو.
– تۆ پێشتر منداڵەکە و پیاوەکەت لە ژوورەوە بینی؟
– بینیمن.
– ئەدی باشە، چییان لێ هات؟
– نازانم.
– چۆن؟!
– پۆلیس هاتن سەروخواری ناو فڕنییەکە گەڕان، نەیاندۆزینەوە. پۆلیسەکان دەیانگوت: بە قاڵدرمەکەوە سەرکەوتوون. سەربانەوسەربان غاریان داوە.
مام جابیر لەناکاو لە مەریوانی معاون موفیدی پرسی:
– کاک مەریوان، تۆ ئەو بەیانییە مەلا چاو بە

کلت دیت فڕنییەکەی خۆی بکاتەوە؟
- نەخێر.
- ئەدی کێ هاتبوو فڕنییەکەی کردبۆوە؟
مەریوان گوتی:
- هەموو بەیانییەک کاتێ من دێم سەموون بکڕم، فڕنییەکە دەمێکە کراوەتەوە و کەوتۆتە گڕەگڕ. نازانم کێ دێ هەموو بەیانییەک دەیکاتەوە.
مام جابیر گوتی:
- کاتێ پۆلیس هاتن، چییان گوت؟
- سۆراغی خاوەنی فڕنییەکەیان دەکرد.
- مەلا چاو بە کل؟
- بەڵێ.
- چییان گوت؟
- دەیانگوت «لەکوێیە؟ دەبێ بیدۆزینەوە!».
- ئەدی پاشان؟
- کاتێ زانییان کە «مەلا چاو بە کل» خاوەنی فڕنییەکەیە، گوێم لێ بوو یەکێکیان گوتی «لەوانەیە دەستی شاگردەکانی لەم کارەدا هەبێ».
- ئەدی خەڵکەکە چییان دەگوت؟
- ئەوانیش هەر ڕایان وابوو کە یەکێک لە شاگردەکان بووە.

مام جابیر پرسی:
- پۆلیس نەچوونە سەربان؟
- با چوونە سەربانیش. دیار بوو شوێنپێیان هەڵدەگرتن.
- کێی دیکەش لەگەڵ پۆلیسەکان بوو؟
- کاک ڕۆستەمی شاگردی مام قادر.
- ئەویشیان برد؟
- بەڵێ، وابزانم بردیان. گوتیان «ئیفادەمان بۆ بدە». ناونیشانی ژنەکەی مام هادی پەرەشووتیشیان وەرگرت و گوتیان «پاشان دێینەوە بە شوێن تۆدا».
- هیچیان لە تۆ نەپرسی؟
- با.
- گوتت چی؟
- چیم بۆ تۆ گێڕایەوە، ئەمەشم بۆ ئەوان باس کرد. من تەنیا ئەوەندەم ئاگا لێ بوو.
- تۆ هیچی دیکەت نەدیت؟
-هیچی دیکەی وەکو چی؟
- «مەلا چاو بە کل» ؟!
- کاتژمێر دەوروبەری شەش و نیو دەبوو. پۆلیسەکان کاک ڕۆستەمی شاگردەکەی مام قادریان

قادر قیرۆی خاڵی یووسف دەیزانی مام جابیری زاوای، لێفەدروویەکی بەلەنگازە، دەستی کورتە و لەو ماوەیەدا پارەیەکی زۆری سەبارەت بە بزربوونی یووسف خەرج کردووە، چوو مەردانە حەفتا دیناری خستە دەست بەڵقیس خانی خوشکی و گوتی:

– بەڵقیس ئەو بڕە پارەیەم لێ قبووڵ بکە!

بەڵقیس خان گوتی:

– جابیر قبووڵی ناکا، قیرۆ.

– چۆن؟

– لێم تووڕە دەبێ و دەشتداتەوە. وەری ناگرێ.

گوتی:

– باشە، قەیناکە؛ هەڵیدەگرم: ئیشاڵڵا جەژنی داهاتوو بۆ یووسف بە کورتەک و شەڵوارێکی تازەی دەدەین.

بەڵقیس قیرۆی برای ماچ کرد و چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک:

– ئیشاڵڵا.

ڕاپێچ کرد بۆئەوەی ماڵی «مەلا چاو بە کل»یان پیشان بدا. کاک ڕۆستەم لەگەڵ پۆلیسەکان چووبوو بۆ ماڵیان.

– لە ماڵ بوو؟

– نازانم.

مام قادری قەیاغفرۆش، لەسەر خوانی ئێوارە دانیشتبوو، بە ژنەکەی خۆی گوت:

– دەڵێن پیاوێک لە گەڕەکی باداوان، پێرێ شەو، کوڕەکەی خۆی سەربڕیوە و چوویشە خۆی تەسلیمی پۆلیس کردووە و گوتوویەتی «کارێکی ئاوهام کردووە».

– استغفرالله، پیاوەکە، چۆن؟ لەسەرچی؟

مام قادری قەیاغفرۆش گوتی:

– کوڕەکەی قووندەر بووە. لەسەر کارەکە گرتوویەتی و زانیویەتی چیی کردووە.

– هەر سەری بڕیوە؟!

– هەر سەری بڕیوە. سەری کوڕەکەی خۆی بڕیوە.

دایزە ویدادی ژنی مەلۆ خەنجەرچی، بە ئەبڵە سەمیرەی ژنی کاکل بنجووی دەگوت:

– گۆزم کۆر ئۆلسن، یووسف نە گوزەل ئۆغلانیدی!

– ویش..

جەیرانی پووری یووسف، بەم قسەیە، یەکسەر جەرگی بووە ئاو، بە چمکی کراسەکەی فرمێسکەکانی خۆی سڕییەوە:

– «جوانی» سەرت دەخوا.. خوشکم.

عوسە کەڕ و تاهیر تەسبیح و جەمیل دۆخین، لە چایخانەکەی «مام نیعمەتی کۆترباز» کە دەیڕوانیە بەرامبەر مزگەوتی شێخی چۆلی، بەدیار سەما و گۆرانییەکانی سەمیرە تۆفیقی تەلەڤزیۆنە رەش و سپییەکەوە دانیشتبوون: گەمەی ئەزنیفیان دەکرد، دووکەڵی جگەرەیان بە با دەدا و باسیان لەوە دەکرد کە هەر یەکەیان بۆ یەکەمین جار کەی بوو تامی سمت و کەفەڵی منداڵیان کردووە. عوسە کەڕ گوتی:

– ئەوکات تەمەنم هەژدە ساڵ بوو. راستییەکەی: هەستم دەکرد ئەم ژیانە حیزە شەڕێکی توندە لەنێوان خەڵکی گەورە و خەڵکی منداڵ. هەفتەی دوو سێ رۆژان دەچووینە مەلعەبەکەی کووران لەسەر رێگای عەنکاوە بۆ فوتبۆڵێن. بەبیرتە عوسە؟ هەندێ ئێوارەش هەر لە چایخانەی ئەتڵەسی خۆمان لە خانەقا دادەنیشتین. خەڵکی گەورەی وەک عەریف عیسا و سەلیم سارووخ و قادر قیمەکێش بەردەوام مرخییان لە منداڵی وەک من و تۆ خۆش کردبوو. خوا خوایان بوو کوڕێکی جوان بێتە ناویانەوە و بیکەنە قلی خۆیان.

– تۆش ئیدی، منداڵێکی جوان بووی.

یاسین، ئەو ئێوارەیە، بۆ تۆژینەوە لە مەسەلەی یووسفی برای، لەناو مەخفەری تەیراوە، لەناکاو دیسان چاوی بە عەریف عیسا کەوت.

ئەو عەریف عیسایە، زۆربەی ئێواران لە بەردەم دەرگای حەمام موراد ڕادەوەستێ و خەڵک دەڵێن «منداڵبازە و پیاویش دەخاتە سەر خۆی». زۆر سەیرە! یاسین لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «عەریف عیسایەکی منداڵباز لە پۆلیسخانە بێت و لە مەسەلەی برای من بکۆڵێتەوە؟!». عەریف عیسا لێرە چ دەکا، خوایە! یاسین پێی سەیر بوو: پۆلیس خۆی منداڵباز و دوودەرکی بێت! یاسین پێی سەیر بوو: پۆلیسێکی منداڵبازی دوودەرکی دۆسیەی برا لاقەکراوەکەی لەم ژوورەی مەخفەرەوە بباتە ئەو ژوورەی دیکە و تەنانەت لەوانەیە سەرپەرشتیی حوکمدان بەسەر تاوانەکەشدا بکات..! سەیرە!

بەڵقیس خان دەلاڵایەوە و بە فەهیمەخانی ژنی تۆپپاڵ جەلال بەزازی دەگوت:

– لە چاوان کوێر بم، وەیش.. یووسف تێر بۆنی منداڵیی خۆی نەکرد. بە باوکی دەگوت «بابە بچمە مەسبەح؟» باوکی دەیگوت «مەسبەح منداڵبازی لێیە، کوڕم، نەچی!»؛ بە باوکی دەگوت «بابە بچمە سینەما؟» باوکی دەیگوت «سینەما منداڵبازی لێیە، کوڕم، نەچی!»؛ بە باوکی دەگوت «بچمە مەلعەب؟» باوکی دەیگوت «مەلعەب منداڵبازی لێیە، کوڕم، نەچی!»؛ بە باوکی دەگوت «بابە بچم خۆم فێری پاسکیل هاژووتن بکەم؟» باوکی دەیگوت «ناوپاسکیلچییان منداڵبازی لێیە، نەچی، کوڕم!». وەیش..! ئەم ژیان و ئەم دنیایە لەو یووسفە بەستەزمانەی من حەڕام ببوو، ئنجاش..

فەهیمەخانی ژنی تۆپپاڵ جەلالی بەزاز لەگەڵ بەڵقیس خان هۆن هۆن دەگریا:

– وڵاتی ئێمە ئشتەم ئاوهایە بەڵقیس خان.. منداڵ لە شاری ئێمە بۆیە فێری هیچ نابن. بەخوا منداڵی منیش، باوکیان ناهێڵێ لە کونی ژوورەوە بێنە دەرەوە.

– ئیدی ژیان ئەو زۆرانبازییەی نێوان گەورەکان و منداڵەکان بوو: یان دەبوایە ببمە «قلێک» یانیش دەبوایە بێمە ریزی پیاوان و خۆم قوتار بکەم.
تاهیر تەسبیح گوتی:
– بێگومان چارەسەری دووەم خۆشتر بوو.
ئنجا گوتی:
– منیش، دەزانی بە کێ دەستم پێ کرد؟
– بە کێ؟
– «نەجۆ».
– «نەجۆ نازدار»؟
هەر سێکیان دایانە قاقای پێکەنین.
– بەختت هەبووە هەی غەددار.
– نەجۆ نازدار یەکەم قل بوو لە ژیانمدا، بەڵام شتی وا خۆش نابێتەوە لە هەموو دنیا.
عوسە کەڕ هەپ بەیازێکی فڕێ دا، گوتی:
– نەجۆ پێشتر کۆنەچاڵی سەلیم سارووخیش بووە، گیانە.
– بەڵام لەناو کچانت دانابا، فەرقت پێی نەدەکرد. ئنجا چەندیش خۆشی دەویستم!
– بەڕاستتە؟
– هەموو جار پێی دەگوتم «جەمیل، تۆ ئەگەر

دەستت بگاتە کچێک، دڵنیام واز لە من دەهێنی. وا نیە؟». منیش دەمگوت « هەرگیز». دەیگوت «بەخوا زۆر دەترسم ئەگەر کچێک یان ژنێکت دەست بکەوێ، واز لە من بێنیت!». منیش لەو کاتانەدا لە دڵی خۆمدا دەمگوت «ئنجا کوانێ لەم شارەدا کچ؟ لەکوێ؟».

لەم کاتەدا تاهیر تەسبیح ویستی لە نۆرەی خۆیدا قسە بکا، جەمیل دۆخین ڕێی قسەی گرت و گوتی:

– تۆ، هیچ قسە مەکە!

لەگەڵ عوسە کەڕ دەستیان کردە پێکەنین؛ عوسە کەڕ گوتی:

– تۆ بابەلباب بۆت ماوەتەوە. دەرانین.

– ئەوەی تۆ.. ویراسییە.

یاسین، ئەو شەوە، خەونێکی عەنتیکەی دیت:

یاسین بووە فریشتەیەک و دەفڕی. هەر بە ئاسمانەوە باڵەکانی لێک دەدا. تا وردە وردە گەیشتە سەر گەڕەکی تەعجیل (ئەو گەڕەکەی کە هاوڕێکانی خۆی و منداڵی دیکەش، لەبەر سەلیم سارووخ نەیاندەوێرا بەشەوان تەنانەت پێنج دەقیقەش چیە لە ماڵ بێنە دەرەوە و پیاسەیەک لەناو جادە بکەن). چووە سەر گەڕەکی خانەقا (ئەو گەڕەکەی کە هاوڕێکانی خۆی، لەبەر کەریم کەرگێ نەیاندەوێرا تەنانەت بۆ جارێکیش بچنە سینەما حەمرا و فلیمێکی شەمشوون یان ڕینگۆ تەماشا بکەن). چووە سەر گەڕەکی ناوقەسران (ئەو گەڕەکەی کە هاوڕێکانی خۆی، لەبەر عوسە کەڕ نەیاندەوێرا بچنە چایخانەیەک دانیشن دەستێک دۆمینە بکەن).

یاسین، هەر بە ئاسمانەوە، لەبەر دەرگای ماڵی هەر یەکێک لە هاوڕێکانی خۆی، باڵەکانی خۆی لێک دەدا و یەک یەک لە دەرگای ماڵی هەموویانی دا. هەموویانی بانگ کرد. هەموویانی کۆکردەوە: لە چایخانەکەی مام عیدۆی مێردی ئیسپۆکی پووری خۆی، کە عادەتی بوو تەنیا لەوێ بوێرێ دانیشێت،

جەمال سێوان ئامۆزای جابیر جەنازە بوو، لەناو چایخانەکاندا لەگەڵ منداڵبازەکانی گەڕەکی تەیراوە و خانەقا هەڵسوکەوتی زۆری هە بوو.

بەڵقیس خان، ئەو شەوە، کە لەگەڵ مام جابیری مێردی بەدیار تەلەڤزیۆنەوە دانیشتبوون تەماشای «صور من المعركه»یان دەکرد، بە نووزەیەکی بریندارەوە بە مێردە کلۆڵەکەی خۆی گوت:

– جابیر بۆ ناچیتە لای جەمال سێوانی بنعامی خۆت و پرسیارێک لە ئەویش بکەی؟

– پرسیاری چیی لێ بکەم؟

– چووزانم. ئەو لەگەڵ ئەم خوێڕی و تۆڕییانە زۆر هەڵدەستێ و دادەنیشێ. بەڵکو خەبەرێکی لە شتێک هەیە!

دانیشتن.

یاسین دەیدیت: سبحان الله، هاوڕێکانیشی، لەناو چایخانەکەدا، هەموویان وەک خۆی، باڵیان لێ ڕوابوو. تەنانەت پۆلیسەکانیش - کە لەبەردەرگا پاسەوانێتیی ئەوانیان دەکرد، باڵیان لێ ڕوابوو.

لەناو چایخانەکە، پێش ئەوەی یاسین دەست بە قسان بکات، چەند فریشتەیەک، باڵدار، سمێڵ تۆپ، هاتن دەمانچە و فیشەگ و چەقۆ و دامرێکس و قامە و خەنجەریان بەسەر یاسین و هاوڕێکانی دابەش کرد. ئنجا یاسین دەیویست بەرامبەریان بکەوێتە قسە و پێیان بڵێ:

- برادەران، ئێمە لێرە کۆبووینەتەوە بۆئەوەی دژی منداڵبازەکان بجەنگین و لەناویان ببەین..

دیتی: برادەرێکی زۆر نزیکی خۆی، نەوزاد تیرۆگ (کە شەوێکیان باوکی ئەو نەوزادە بە تیرۆگ نەوزادی لە ماڵەوە ڕاو نابوو - بۆیە ناویان نابوو نەوزاد تیرۆگ) تیرۆگێکی درێژی ئەستوور بەدەستەوە، لە ناوەڕاستی هەموو برادەرەکانی ڕاوەستابوو، گوتی:

- ئێمە نەک تەنیا منداڵبازەکان، بەڵکو پێویستە

هەمـوو خـەڵکی گـەورە (پیـاوەکـان) لەناو ببـەین و بیانکوژین.
سـەربەست، کـە پۆلی چوارەمی ئامـادەیی بوو و جـارێکیـان لەناو مـەسـبـەحی ئیـدارەی مـحەللی، شـەفـیق شـەللاتی چووبوو بێـحـامـەکـەی هێنابووە خوارەوە و ویستبووی ڕایکێشێتە ژوورێکەوە و هەر بۆیەش لەو ڕۆژەوە مـەسـبـەحی تەرک کـردبوو و نەیتوانیبوو فێری مەلە ببێت، بە سەرسوڕمـانەوە گوتی:
- هەموو پیاوەکان؟!
- بەڵێ هەموو پیاوەکان. چونکە هەموو خەڵکی گەورە بەرامـبـەر ئێـمـەی منداڵ تاوانبارن. هەمـوو خـەڵکی گـەورە بەرامـبـەر چارەنووس و داهاتووی ئێمەی منداڵ گوناهکار و بەرپرسیارن.
کـارزان لە هەمـوویان بچـووکـتـر بوو، کـوڕە دەوڵەمـەندێکی گـەڕەکی ناوقـەسـران بوو، لە ترسی حـەمـیـد حـەربە- کـە هەمـیـشـە لە چایخـانەکـەی بەرامبەر خەلیل پاسکیلچی دادەنیشت - هەرگیز نەیدەوێرا بچـێـتـە لای خـەلیل پاسکیلچی و پاسکیلێک بۆ خـۆی بەکـرێ بگرێت بۆئەوەی خـۆی فـێری هاژۆتنی پاسکیل بکات، لە نەوزاد تیرۆگی

پرسی:

– یەعنی باوکی خۆشمان؟

– بەڵێ، باوکی خۆشمان. مامەکانمان، خاڵۆکانمان، تەنانەت برا گەورەکانیشمان..

فەرەیدوون کە تا ئەوکاتەش هەر باسی دەکرد جەمیل دۆخین و مەجید مزەڵڵی وازی لێ ناهێنن، گوتی:

– بۆچی؟ خۆ ئەوان مندالّباز نین؟!

نەوزاد تیرۆگ گوتی:

– ئەو پیاوانە، ئەو گەورانە (باوکمان، خالّمان، مامەکانمان..) ئەوانەی مندالّباز نین، خەتای ئەوانە کە ناتوانن ئەو مندالّبازانەمان لەکۆڵ بکەنەوە. خەتای ئەوانە کە دەمانخەنە ناو ئەو مندالّبازانەوە. خەتای ئەوانە کە نایانەوێ لەدەست ئەو هەموو مندالّبازانە بمانپارێزن. ئەو خەڵکە گەورانەن کە بوونەتە هۆی بەدبەختیی ئێمە و دەردەسەرییەکانمان.

سالار، کورە فەرمانبەرێک، تەمەنی پازدە ساڵ، دوو جاران لەدەست کەریم کەرگێ غاری دابوو، بۆچوونەکەی نەوزاد تیرۆگی پەسەند کرد و گوتی:

– بەڵێ، هەموو پیاوە گەورەکان، باوکەکانمان، مامەکانمان، خاڵەکانمان.. چونکە ئەوانن «کە بەو

بچووکی و بێ توانایییەی خۆشمانەوە» دەماننێرن بچین لە کارگەکاندا کاربکەین، دەماننێرن لەسەر جادەکان، لەناو چایخانەکاندا گوڵەبەڕۆژە و بنێشت بفرۆشین و بۆیاغچێتی بکەین، لە دوکانی خوێری و توێری و منداڵبازەکاندا دەمانکەن بە شاگرد.. ڕۆژانە و قازانجەکانیشمان بۆ خۆیان دەیخۆن.

ئنجا «ئیبۆ» بە هەمان شێوە پەسەندی بۆچوونەکانی ئەوانی کرد و گوتی:

- بەڵێ، ئەو خەڵکە گەورانەن کە بوونەتە هۆی بەدبەختیی ئێمە و دەردەسەرییەکانمان.

- بەڵێ، ئێمە پێویستە ئەم شۆڕشە دژی هەموو پیاوەکان و گەورەکان بکەین، بەڵام پێویستە لەسەرەتادا بە منداڵبازەکان دەست پێ بکەین.

فەرەیدوون پرسی:

- چۆن دەست پێ بکەین؟

- بیانکوژین.

- تۆڵەی هەموو منداڵێکی ئەتککراویان لێ دەکەینەوە.

- تۆڵەی هەموو منداڵێکی لاقەکراویان لێ دەکەینەوە.

- ورگی هەموویان هەڵدەدڕین.

– هەموو شتێکمان هەیە: دەمانچە، فیشەگ..
– بە چەقۆ..
– بە خەنجەر..
– بە قامە..
– لە ماوەی یەک هەفتەدا هەموویان لەناودەبەین.
– ئیتر ئەم شارە لە مندالّباز پاک دەبێتەوە.
– ئیتر لەمەودووا بە ئارەزووی خۆمان دەتوانین بچینە سینەماکان..
– ئیتر لەمەودووا بەوپەڕی سەربەستییەوە دەوێرین بچینە چایخانەکان..
– ئیتر لەمەودووا دەتوانین بێ ترس تا نیوەشەویش لە دەرەوە بمێنینەوە..
– ئیتر لەمەودووا شەو ژیانی تێدا دەژێتەوە؛ هەموو ئێوارەیەک تەنانەت تا نیوەشەوانیش بازاڕ و شەقامەکان زیڕەوشان دەبنەوە؛ ژیان بەناو شەویشدا دەست پێدەکاتەوە..
– ئیتر دنیا دەبێتە دنیای پاکی مندالاّن..
– ئیتر دنیا دەبێتە دنیای خەڵکی پاک و بێگوناح و سادەی وەکو خۆمان.
– بژی مندالّ!
– بمرێ مندالّباز!

لەناو چایخانەکە، منداڵەکان، هەر یەکە و چەقۆیەک یان دەمانچەیەک یان خەنجەرێک بەدەستەوە، هەموویان یەک بە دەنگ هاواریان دەکرد:

- بژی منداڵ!
- بمرێ منداڵباز!

لەو هاتوهاوارەدا بوو، یاسین لە خەونەکەی بێداربووەوە. کاتێ هەڵسایەوە، لە سەربانە فێنکەکەی ماڵی خۆیاندا عارەقەیەکی خەستی کردبوو. دڵی تەپ تەپ لێی دەدا. لەناکاو کە ئاوڕی لای دەستەچەپی خۆی دایەوە، دیتی: باوکی، لەژێر لێفەیەکی ئەستووردا هێنکەهێنکی پێ کەوتووە و «مەژغوولە».. ئەژنۆی دایکی خۆیشی بینی: ڕووت.. هەڵدەلەرزی.

نزاری کوڕە پارچەڵەکەی مام قادری قەیاغفرۆش کە برادەر و هاوزای یووسف بوو، ئەو شەوە دیسان خەونێکی ناخۆشی دیتبوو: «خەلیل پاسکیلچی» و «عوسە کەڕ» و «کەریم کەنناس».. بە هەر سێکیان، لەناو بەستەکەی ژێر پردی سەیداوە، پەلکێشیان دەکرد و دەیانویست بیبەنە ناو تاریکییەکە. نزاریش هەر هاواری دەکرد و کەس نەدەگەیشتە فریای. مام قادری قەیاغفرۆش دیسان لەگەڵ هاوار و لالانەوەی کوڕەکەی خۆی خەبەری بوویەوە:

- لا حول و لا قوە الا باللە..

.. ئۆف، یووسف، کوێراییم دایە!

ڕۆژێک هاتەوە ماڵ، دەگریا، گوتی «دایە..». گوتم: «گیانی دایەی؟». گوتی: «ئەمڕۆ، دوو ئیستیخباراتی پیاوی حکوومەت لەناو جادە ڕایانگرتم، داوای هەویەیان لێ کردم. منیش هەویەم پێ نەبوو. گوتیان:

- لێش ما تشیل هەویە؟.

منیش گوتم: ئانی نسێت ئەشیل هەویە.

ڕەشە قوتەکەیان گاڵتەمی پێکرد، گوتی:

- نسێت تشیل هەویە؟

گوتم: ئی. نسێت. بەس باکر ئەشیل هەویە.

ئەمنەکەی دیکە، ئەسمەرێکی قەڵەو بوو، گوتی:

- یەعنی باکر تشیل هەویە؟

منیش گوتم: ئی.. باکر ئەشیل.

ڕەشە قوتەکە، گوتی: تشیل؟

گوتم: ئی.. ئەشیل.

ئەم جارە ئەمنە ئەسمەرە قەڵەوەکە دیسان لێمی پرسییەوە:

- تشیل.. ها؟

گوتم: ئی.. ئەشیل.

دیسان گوتی: تشیل؟

منیش نەمـــدەزانی گـــاڵتـــەم پێ دەکـــەن و پێم ڕادەبوێرن، گوتم:

– ئی.. ئەشیل.

پاشان ئەمنە قەڵەوەکە گوتی:

– یەعنی ئینته تگدەر تشیل؟

گوتم: ئی.. ئەشیل.

– تشیل؟

– ئی، ئەشیل.

هەردووکـــیـــان پێـــدەکـــەنین و نەمـــدەزانی پێم ڕادەبوێرن.

پاشان ڕەشە قوتەکە لێمی پرسی:

– تجی مەعانا تشیل ئیلنا؟

منیش گوتم: وێن؟

گوتی: نرووح. عدنا مەکان.

منیش گوتم: وێن نرووح؟

گوتی: ئینته تشیل و ما عەلێک.

کاتێ ئاوهای گوت، ئنجا تێگەیشتم. گوتم:

– ئەنا باکر ئەشیل هەویە!

کەچی ڕەشە قوتەکە گوتی:

– لەعد تەعـال ئینطینە نێچە و بەعـد مـا نطلب هەویە مننەک.

حاكم بێوار، لەژێر چاویلكە ئەستوورەكەیەوە، بێدەنگ،، لە دۆسیەی مەولوود منداڵباز ورد دەبۆوە. لەناكاو، گوتی:

– دەک نەعلەتت لێدە، زەلام!

محامی كاكل، كە پارێزەری كێشەی مەولوود منداڵباز بوو، گوتی:

– شەیتانیش دەستی لێ شۆردووە، جەنابی حاكم.

حاكم بێوار گوتی:

– مام جابیری باوكی یووسف هەقیەتی كە گومانی چۆتە سەر ئەم خوانەناسە.

محامی كاكل بە نیمچە تەوسێكەوە گوتی:

– ئەدی كەواتە بۆچی لە هەمان كاتیشدا شكاتی لە «مەلا چاو بە كل» كردووە؟

– پێم وابێ بەدبەختییەكەی «مەلا چاو بە كل» لەوەدایە كە شوێنی تاوانەكە هی ئەوە: كارەساتەكە لەناو فڕنییەكەی ئەودا ڕووی داوە. ئەگینا «مەلا چاو بە كل» هێندە جێگەی گومان نیە...

– ئێمەی مافپەروەر، گەورەم، هەمیشە بە شتێكی ڕاستی دەزانین بپرسین: «بۆچی؟».

حاكم بێوار پێی خۆش بوو كە محامی كاكلێكی

– لای عەقید عەلی دێمەوە.

– چیی تازە هەیە، كوڕم؟

یاسین گوتی:

– شێرۆ مەدفەعیان بەرداوە.

باوكی یووسف تووڕە بوو:

– ئەوە برا ئیستیخباراتە خوێرییەكەیەتی!

ئنجا دەستی دایە كورتەک و شاڵوارەكەی، خۆی كۆكردەوە بچێتە مەخفەری تەیراوە:

– چۆن دەبێ بەربدرێ؟! ئەدی نابێ بزانین ئەم منداڵە بەستەزمانەی ئێمە لەكوێیە و كێ ڕفاندوویەتی؟

---

مام قادری قەیاغفرۆش ئەو نیوەڕۆیە خەریک بوو لە داخان شێت ببێ، لەسەر خوانی نیوەڕۆ بە ژنەكەی خۆی گوت:

– مەولوود منداڵباز لە مووسڵ كوژراوە .. شێرۆ مەدفەع بە واسیتەی برا ئیستیخباراتەكەی بەردراوە .. وەڵحاصل قوڕەكە بۆ «مەلا چاو بە كل»ی بەستەزمان خەست بۆتەوە.

ژنەكەی، هەموو جارێک لەم كاتانەدا، تەنیا هێندەی پێ دەكرا بڵێ:

– وەیش..!

مام قادر بەئەسپایی ڕووی كردەوە ژنەكەی:

– ئەم حزبی بەعسە وێرانی كردین. بەخوا حزبی بەعس دەیەوێ ئابڕووی مەلاكانیشمان ببا. هەر خۆشیانن یووسفی كوڕەكەی جابیریان ڕفاندووە. ئەمن مردوو، ئەتۆ زیندوو! هەر دەردەكەوێ.

منیش خۆم وا پیشان دا كە عەرەبییەكە باش تێنەگەیشتووم. گوتم:

– باكر ئەنطیكوم هەویە. باكر ئەشیل هەویە.

كەچی ئەسمەرەكە گوتی:

– لا. لا. ئینطینا نێجە و ما نرید هەویە...

كوێراییم دایە، یووسف! دەیگوت:

– دەترسام غار بدەم. دەترسام ئەگەر غاربدەم تەققەم لێ بكەن!

ئاخریش هەر غاری دابوو. كاتێ غاریشی دابوو، دووای كەوتبوون. كاتێ گەیشتە ماڵەوە، هێنكە هێنكی پێكەوتبوو. هەر دەگریا. بۆ شەوەكەی، لە خەونیشدا هەر هاواری دەكرد و دەگریا. ئەو ماوەیە بەردەوام لە خەو خەبەری دەبۆوە و پێی دەگوتم: «دایە، دەترسێم..». دەمگوت: « نا، كوڕی خۆم. لە چی دەترسێی؟». دەیگوت: «لەوە دەترسێم بێن بمبەن». دەمگوت: «نا، كوڕی خۆم. كێ دەتبا؟». دەیگوت: «با.. دەمبەن، ناگەڕێمەوە..».

ئۆف، یووسف گیان، یووسفی من.. جەرگەكەم.. كوێراییم دایە.. قسەكەی خۆت ڕاست دەرچوو: چوویتە دەرەوە و نەگەڕایتەوە.. كوێر بم!

گەنج لە دانیشتنێکی ئاوها خۆمانەشدا هەر شێوازە ڕەسمی و پڕ حورمەتەکەی خۆی دەپارێزێ، گوتی:

– ئەمەتا یەکێک لە بەڵگەکان: مەولوود منداڵباز تەنیا لە ماوەی دەساڵی ڕابردوودا زیاتر لە هەژدە حاڵەتی هاوشێوەی هەیە.

محامی کاکل گوتی:

– گەورەم، کەواتە، بێ تاوانە.

– کێ؟

– مەولوود منداڵباز.

– چۆن؟

– چونکە ئەم مەولوودەی کە ناوی بە «منداڵباز» ڕۆیشتووە، هەتا ئەم دەقیقەیەش جارێ هێشتا هیچی لەسەر نەسەلماوە.

– کاک کاکل، وابزانم تۆ بەبێ هیچ بەڵگەیەک بەرگری لەم تاوانبارە دەکەیت.

– جەنابی حاکم، تۆ خۆشت دەزانی: ڕەوا نیە ئێمە بچین لەسەر بنچینەی تاوانەکانی ڕابردووی «تاوانبار» حوکم لەسەر کێشەیەکی تازەی بدەین کە ئەمڕۆ هاتۆتە بەردەستمان.

– ئەو تاوانانەی ڕابردوو، ئەوەتا ئەم دۆسیە گەورەیەت دیوە.. ئەمە بە شاهێدێکی باش حسێب

دەکرێت. مەگەر تۆ خۆشت ئەمە نازانی؟ سەیرکە! دووایین حەکایەتی ئەم مەولوود منداڵبازە! هەمووی هەشت مانگ نابێ رووی داوە. تاوانبار لە رۆژی جەژندا دوکانی لگاوی داناوە. منداڵێک لە لگاوەکەدا خەڵاتێکی بردۆتەوە و داوای لێ کردووە خەڵاتەکەی بداتێ. گوێ بگرە دەیخوێنمەوە:

(بە منداڵەکەی گوتووە «خەڵاتەکەی تۆ لە ماڵەوەیە». بردوویەتیە ماڵی خۆی و لەوێ ئەتکی کردووە. بەزۆرەملێ تەعەدای لێکردووە..). تومەز، تۆ سەیرکە! تەنانەت پیشەیەکی کە هەڵیشی بژاردووە بۆ پیادەکردنی «ئەم ئەخلاقە جوانەی خۆی» سوودی لێ وەرگرتووە: دوکانی لگاوی هەبووە!

– گەورەم، یەک دونیا لگاوچی لەم شارەی ئێمە هەن. یەعنی هەموویان منداڵبازن؟

– ئەو شکایەتلێکراوەی تۆ بەرگریی لێ دەکەیت لگاوچی بووە.. پیشەی لگاوەکەی بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێناوە.

– بۆ؟

– لگاو خۆشترین گەمەیە کە منداڵ حەزی لێ دەکەن.

– بەڵگە چیە کە لگاوەکەی بۆ مەبەستێکی وا

بەکارهێناوە؟
- بەڵگە ئاشکرایە: کاتێ منداڵەکە «خەڵاتەکەی» بردۆتەوە، پێی گوتووە: «وەرە بچینەماڵەوە خەڵاتەکەت بدەمێ».
- ئێ خۆ ئەم جارە لگاوی نەبووە؟
- کاک کاکل، تۆ بچۆ سەرجەم ئیفادە و گەواهییەکانی پەیوەندیدار بەم کێشەیە بخوێنەوە، ئنجا وەرە بەرگریی لێ بکە!
-چیی تازە هەیە؟
- بەستر پێرێ شاگردەکەی «مەلا چاو بە کل»ی فڕنیچی دانی پێدا ناوە کە مەولوود منداڵباز داوای لێکردووە کە پێویستە ئەو بەیانییە بۆ ماوەی نیو سەعاتێک فڕنییەکەی بخاتە خزمەت جەنابییەوە..
- ئاگام لەمە هەیە، گەورەم. دوێنێ سێ سەعات زیاتر بە تۆژینەوەی ئەم گەواهییەوە مەژغوول بووم.
- ئێ؟ ئەدی چۆن ڕات نەگۆڕاوە؟
- شاگردێک کە پارەی درابێتێ بۆئەوەی فڕنی بۆ منداڵبازێک چۆڵ بکات؛ هەر بۆ پارە کاری لەمەش خراپتر دەکات.
- کاری لەمە خراپتری وەک چی؟
- گەواهی دانی بەدرۆ. ئەمەی کە ئێستا

کردوویەتی.
- تۆ پێت وایە شاگردەکە درۆ دەکا؟
- بەڵێ.
حاکم بێوار گوتی:
- بەڵام تۆ تازە گوتت «ئەو پیاوەی کە پارەی درابێتێ بۆئەوەی فڕنی بۆ منداڵبازێک چۆڵ بکات..». ئەمە مانای وایە کە تۆ باوەڕت بەمە هەیە کە شاگردەکە فڕنییەکەی چۆڵ کردووە بۆئەوەی منداڵێکی تێدا ئەتک بکرێت!
- بەڵێ. شاگردەکە دەشێ ئەمەی کردبێت.
- ئەدی چی دەمێنێتەوە؟
- شاگردەکە بۆ مەولوود چۆڵی نەکردووە؟
- ئەدی بۆ کێی چۆڵ کردووە؟
- دیارە بۆ خەڵکی دیکەی چۆڵ کردووە.
- بۆ «مەلا چاو بە کل»ی چۆڵ کردووە؟
- نازانم. گرنگ: بۆ شکایەتلێکراوەکەی منی چۆڵ نەکردووە.
حاکم بێوار کەوتە بیرکردنەوە. لە کۆتاییدا گوتی:
- محامی نابێ پشتیوانی لە ناهەق بکات.
- مەبەستت چیە، گەورەم؟
- تۆ لە خۆتت پرسیوە: شکایەتلێکراوەکەی تۆ،

تەنیا هەشت مانگ بەر لە ئێستا، دووای لەسەر سەلمانی ئەم تاوانە گەورەیەش چۆن و لەبەرچی ئازاد کرا؟ کێ ئازادی کرد؟!

محامی کاکل بێ مننەت، بێ ئەوەی یەک تۆزقاڵیش هەست بە ویژدان سەغڵەتی بکا، گوتی:

– مەبەستت ئەوەیە بڵێی کە مەولوود منداڵباز پەیوەندیی بە ئیستیخباراتی بەعسەوە هەیە وکاریان لەگەڵدا دەکا..

– نەخێر..

– منیش دەزانم خزمێکی هەیە ئەمین عامە و هەموو جار بە واسیتە بەری دەدا، بەڵام من کارم بەمەوە نیە کە پێشتر چی ڕووی داوە؛ من بەرگری لە کێشەیەک دەکەم کە ئێستا لە ئارادایە.

– باش.. بەڵام خۆ شاگردەکەی «مەلا چاو بە کل» لە ئیفادەکەی خۆیدا گەواهیی داوە کە فڕنییەکەی بۆ مەولوود منداڵباز چۆڵ کردووە.

– من وەک گوتم: پیاوێک کە بۆ پارە فڕنی چۆڵ بکات، هەر بۆ پارە ئامادەیی ئەوەی دەبێ کە بێتە لای جەنابت سوێندیش بە درۆ بخوات.

حاکم بێوار بەتەواوەتی باوەڕی بە قسەکانی خۆی هەبوو، گوتی:

- محامی کاکل، گوێ بگرە! یەکەم: شاگردە فڕنیچییەکە بۆ پارە فڕنییەکەی چۆڵ نەکردووە، مەبەستم ئەوەیە پیاوێکی بەنەزاکەت دیارە و بۆ پارە «گەووادیی» نەکردووە وەکو چۆن جەنابت پێت وایە! بەڵکو لەترسان بووە.
- هەمان شتە..
- چۆن هەمان شتە؟
محامی کاکل جەختیی کردەوە:
- ئێوە دەتانەوێ بیسەلمێنن کە مەولوود بەزۆر فڕنییەکەی بەو شاگردەی مەلا چۆڵ کردووە.
- بەڵێ، چونکە پێی گوتووە: «ئەگەر چۆڵی نەکەی، دەتکوژم!». ئەمە ئیفادەی شاگردە فڕنیچییەکەیە.
محامی کاکل ویستی سوود لە قسەکانی خودی حاکم وەربگرێت:
- کەواتە، ئەو شاگردە فڕنیچییە ئەگەر وەک ئێوە دەڵێن لەترسان فڕنییەکەی چۆڵ کردبێت، خۆ ئەمڕۆش هەر ترسەکەی لەسەر ماوە: بێگومان، لەترسان دێت ئەمڕۆش هەر درێژە بە کارە خراپەکەی پێشووی دەداتەوە: بەدرۆ شایەدی دەدات و سەر لە هەمووشمان دەشێوێنێ.

- سەر لە کەس ناشێوێنێ. مەسەلەکە ئاشکرایە.
- لای منیش ئاشکرایە.
- تۆ تەنیا دەتوانی بەرگری لە شکایەتلێکراوەکەت بکەیت، ناتوانیت پەنجە لەسەر تاوانباری ڕاستەقینە دابنێیت!
- تۆ باش لە بەرگرییەکەی من حاڵی بوویتە و دەشزانیت مەبەستم چیە، تەنانەت تا ڕادەیەک باوەڕیشت بە ڕاستبوونی قسەکانم هەیە.. بەڵام وابزانم پێویستییت بە چەند ڕۆژێکی دیکە هەیە بۆ ئەوەی بەتەواوەتی بێیتە سەر قەناعەتی من.
- قەناعەتی تۆ ئەوەیە کە...
- من حەزدەکەم سێ شت بۆ بەڕێزتان ڕوون بکەمەوە و بە چاوی بایەخەوە لە منی وەربگرن، جەنابی حاکم.
- فەرموو!
- یەکەم: منداڵێک لەناو فڕنییەکە ئەتک کراوە، بەڵام ئەو منداڵە یووسفی کوڕی مام جابیر نەبووە، منداڵێکی دیکە بووە.
- چۆن؟
- ئەو منداڵەی لەناو فڕنییەکەی «مەلا چاو بە کل»دا ئەتک کراوە، یووسفی کوڕی مام جابیر

نەبووە، منداڵێکی دیکە بووە.
– چۆن؟
– باش.
حاکم بێوار، سەرسوڕماو، پرسی:
– یەعنی لە یەک بەیانیدا، لە یەک کاتدا دوو ڕووداوی هاوچوون ڕوویان داوە؟
– لەوانەیە.
حاکم بێوار بەم بۆچوونە تووشی لەناکاوییەک هات، کاتێ محامی کاکل گوتی:
– چونکە یووسفی کوڕی مام جابیر لە هەمان ئەو بەیانییەدا، لە هەمان کاتدا، لە شوێنێکی دیکە بینراوە.
– لە ئەمنی بەلدە؟
– من نازانم.
– شایەد و بەڵگەت هەیە؟
– لە دانیشتنی داهاتوومان هەموو ئەو شایەد و بەڵگانە ئامادە دەبن.
– دووەم: شاگردەکە فڕنییەکەی چۆڵ کردووە بۆ منداڵبازێک، بەڵام ئەو منداڵبازە مەولوودی شکایەتلێکراوی من نەبووە. کەسێکی دیکە بووە کە فڕنیی بۆ چۆڵ کراوە.

حاکم بێوار هێندێک ڕاڕا و سەرلێشێواو، بە نیگەرانییەوە گوتی:

– بەڵام شاگردەکە دەڵێ: «بۆ مەولوودم چۆڵ کردووە».

– گەورەم، من دەمەوێ ئەمەت تێ بگەیەنم: بۆ مەولوودی چۆڵ نەکردووە. ئەمەیە خاڵی سەرەکیی تێکنەگیشتنی من و تۆ!

– بۆ هەر کەسێکی چۆڵ کردبێت، ئەو کەسە تاوانبارە. بێگومان.

– شاگردە فڕنیچییەکە بۆ مەولوودی چۆڵ نەکردووە.

– کەواتە، بە درۆ شایەدیی داوە.

– بەڵێ. شاگردە فڕنیچییەکە پیاوێکی ساختەچی و درۆزنە. تەنانەت من وای بۆ دەچم ئەو بۆ خۆیشی هاوکار بووە و دەستی لە تاوانەکەدا هەیە: بە جووتە کارەکەیان کردووە.

حاکم بێوار چاویلکەکەی لە چاو داکەند و لەسەر مێزەکەی دانا، بە لەهجەیەکی باوکانە ڕووی کردە محامی کاکل:

– گیروگرفتی بنەڕەتیی ئێمە ئەوەیە: ئیفادەی منداڵەکەمان نییە.

- گەورەم، باشتر وایە بڵێی «ئیفادەی منداڵەکان» چونکە وەک گوتم: تەنیا یەک منداڵ نین.
حاکم بێوار سەری سوڕ ما:
- تۆ ئەمڕۆ خەریکە تەواو سەرم لێ دەشێوێنیت!
- بەڵێ: دوو منداڵ لە یەک بەیانیدا، هەر یەکە و بە جۆرێک..
- هیچیشیان دیار نین کە ئیفادەمان بۆ بدەن.
محامی کاکل پێکەنی:
- گەورەم، هەرچەند ئەمە سر المهنەیشە، بەڵام پێت دەڵێم: با، یەکێک لەم دوو منداڵە دیارن.
- کامەیان؟
- بەڕای تۆ کامەیان؟
- من تەنیا دۆسیەی یووسفی کوڕی مام جابیرم ئاگا لێیە و ئەویش، دەزانم: هەر بەدووایدا دەگەڕێن و تا ئێستا نەیاندۆزیوەتەوە. کەواتە ئەوەی دیکەیانە کە دیارە.
- ڕاستییەکەی: هیچیان دیار نین.
- چۆن؟
- چونکە ئەوەی دووەمیش، باوکەکەی خۆی، پێش چەند ڕۆژێک سەری بڕیوە.

– باوکی خۆی، سەری بڕیوە؟
– بەڵێ. کێشەکە، پێش ئەوەی چەند سەعاتێکی دیکە بگاتە لای جەنابت، لەلایەن منەوە ڕاستەوخۆ لێی کۆڵدراوەتەوە و.. ئەنجامەکانیش دەردەکەون.
– کەی؟
– دووای ئەوەی دۆسیەی منداڵەکەی دیکەشتان خوێندەوە.
– یەعنی بە ڕای تۆ: مەولوود منداڵباز نیە ئەوەی یووسفی ئەتک کردووە؟
– نەخێر.
– ئەدی یووسف کوا؟ کێ ئەوی لاقە کردووە؟
– ئەرکی من تەنیا ئەوەیە بیسەلمێنم: مەولوود منداڵباز کاری بەسەر یووسفی مام جابیرەوە نەبووە.

یاسین ماندوو ببوو، بێزاری و ڕقی گەیشتبووە ترۆپکێک. بیری دەکردەوە بچێ بە چەقۆیەک یان بە قامەیەک شێرۆ مەدفەع بکوژێ، بەڵام گومانی ئەوەی هەبوو کە نەوەک دەستی مەولوود منداڵباز یان «مەلا چاو بە کل» لە کارەکەدا هەبێت. وای بە باشتر دەزانی کە جارێ چەند ڕۆژێکی دیکەش هەر چاوەڕێ بکات تا تۆژینەوەی پۆلیس و مەحکەمە دەگەنە ئەنجامێک: بزانن شێرۆ مەدفەع یان مەلا چاو بە کل یان مەولوود منداڵباز!؟

---

ڕۆستەمی شاگرد لە مام قادری قەیاغفرۆشی پرسی:
– دەڵێن شێرۆ مەدفەع بەردراوە؟!
مام قادر گوتی:
– ئەم بەردراوە و قەحپەدایکەکەی دیکە لە مووسڵ کوژراوە و ...
– وردە وردە قوڕەکە بۆ مەلای بەستەزمان خەست دەبێتەوە.
مام قادری قەیاغفرۆش گوتی:
– خوانەکا. خوا پشتی بێ گوناهان بەرنادا.
– ئەرێ ئەو پیاوە کێیە، ناوی چیە؟ ئەوەی کوڕەکەی خۆی کوشتووە؟
مام قادر گوتی:
– ئاخر ئەو بوو گووی کردە ئیشەکە.
– ناوی چیە؟ کێیە؟
– مام شەریف، مام شەریفی چایچیی ناو گەراجە کۆنەکە.
– دەڵێن خۆیشی خۆی تەسلیم کردۆتە پۆلیس؟
– بەڵێ. بەڵام دووای ئەوەی چۆتە مووسڵ مەولوود منداڵبازیشی سەربڕیوە.. ئنجا.
–خۆی دانی پێدا ناوە کە مەولوود منداڵبازی

یاسین، لەسەر نانخواردن، خەونە عەنتیکەکەی خۆی – کە چۆن خۆی و هەموو منداڵەکان، باڵیان لێ ڕوواوە و ویستوویانە شۆڕش بەسەر خەڵکی گەورەدا بکەن – بۆ دایک و باوکی گێڕایەوە. باوک بێدەنگ، بەڵام دایکی، بەنەرمییەوە دەستی لەسەر چۆکی یاسین دانا و ئامۆژگاریی کرد:
– کوڕی خۆم، دووایە بڕۆ ئەم خەونە ناخۆشەت بۆ ئاو بگێڕەوە!
– بۆ کێی بگێڕمەوە!؟
– بۆ ئاو.
یاسین سەری سوڕ ما، پرسی: «بۆچی بۆ ئاو؟!».
دایکی گوتی:
– ئەمە عادەتە. هەر کەسێک خەونێکی خراپ ببینێت، دەبێ بچێ بۆ ئاوی بگێڕێتەوە: بۆئەوەی ئاو شتە خراپەکانی ئەو خەونە بشواتەوە.
یاسین، دووای بیرکردنەوەیەک، گوتی:
– دایە.. لەوانەشە بۆئەوە بێت کە ئاو پەیامی ئەم خەونە ناخۆشە بە ناو خەڵکدا بڵاوبکاتەوە. وانیە؟

یاسین وای لێ هاتبوو پۆلیسی مەخفەری تەیراوەی لەپێش چاو کەوتبوو: چونکە هەر جارێکی دەچووە ئەوێ بۆ تۆژینەوەی تازەتر و وەرگرتنی خەبەرێکی تازە لەبارەی یووسفی برای، چاوی بە «عەریف عیسای منداڵباز» دەکەوت.

ئێ باشە عەریف عیسا پۆلیسە! چۆن پۆلیسێک کە بەرپرسیاری کێشەیەکی ئاوهایە، بۆ خۆی لەپێش دەرگای حەمام و سینەماکاندا بەدووای منداڵاندا بگەڕێت و منداڵبازی بکات، کەچی لە مەخفەری پۆلیسیش بێت!؟

یاسین بیری لەمە دەکردەوە و نەیدەتوانی تێ بگات! زۆر سەیرە: پۆلیس خۆی منداڵباز بێت؟!

کوشتووە؟

– بەڵێ. چووە گوتوویەتی «ئەو مەولوود منداڵبازە بووە کە کوڕەکەی منی ئەتک کردبوو».

ڕۆستەم گوتی:

– کەواتە مەولوود منداڵبازیان بەخۆڕایی لە مەخفەری پۆلیسی تەیراوە تەوقیف کردبوو.

مام قادر گوتی: چۆن بەخۆڕایی؟

– مەبەستم: دەستی مەولوود مەنداڵباز لە کارەکەی یووسفی کوڕی مام جابیردا نەبووە.

–بەڵێ، بەڵام ئەو.. کوڕەکەی مام شەریفی ئەتک کردبوو.

– لە خۆی بە شک بووە، بۆیە زندانی شکاندبوو و غاری دابووە مووسڵ.

مام قادر گوتی:

– عەمری نەمێنێ. هەر لەناو زینداندا بمایەتەوە، باشتر بوو.

مام شەریفی چایچی لەناو زیندانی سەرای هەولێر چاوەڕێی حوکمی خۆی دەکرد: موئەببەد، بیست ساڵ، نۆ ساڵ؟! نەیدەزانی.
لەودیو شیشەکانی ژووری زیندانەوە بە جابیر جەنازەی باوکی یووسفی گوت:
– بەڵێ، بەدووایدا چوومە مووسڵ. لە هوتێلە دوو نەجمەکەی «دەوواسە»دا گرتم. شەو بوو. بە خشپە لێی چوومە ژوورەوە و سێزدە چەقۆم لێی دا.. پاشانیش، هەر لەسەر سیسەمەکەی خۆی، سەرم بڕی. گەووادی وا! ئەمیش و شێرۆ مەدفەع و تاهیر تەسبیح و کەریم کەرگێ و حەمید حەڕبە و قادر قەنینە و هەموویان.. هەموویان ئیستیخباراتی بەعس و بەکرێگیراوی حکوومەتن. هەر بۆیەش حکوومەت هیچیان لێ ناکا و لێیان ناپرسێتەوە. پێویستی پێیان هەیە. بۆیەش هەرچی تاوان و گوناح و دزی و حیزبیەکی دەیکەن، حکوومەت دوو ڕۆژان دەیانخاتە ژوورەوە و دووایە یەکسەر بەریان دەدا. من دەمێک بوو دامنابوو بەم مرازەی خۆم شاد بم. ئەوەتا.. سێزدە چەقۆم لێ دا و سەریشم بڕی. ئێستاش بێ مننەتم: چیم لێ دەکەن، با بیکەن! گەوادی ئاوها.. پێشتریش دوو جاری دیکە ڕێگەی

یاسین دوێنێ شەو لە خەونیدا کابووسێکی بینی:
لەناو چایخانەی کەوبازان، لەناوەڕاستی قەیسەرییەکەی ناوبازاڕ، بەدیار شەڕە کەوێکەوە ڕاوەستابوو.. لەناکاو «عوسە کەڕ» باوەشی پێدا کرد و بەبەرچاوی ئەو هەموو پیاوەوەی ڕاوەستابوون تەماشای شەڕەکەوەکەیان دەکرد، یاسینی هاوێشتە ژێر خۆی و دۆخینی یاسینی کردەوە و دەستی لەناوقەدی ئاڵاند و بە دەستەکەی دیکەیشی خەریکی بوو..
یاسین هەر هاواری دەکرد و کەس نەبوو گوێی لە دەنگی بێت. لەناکاو یاسین تێگەیشت کە دەنگی هاوارکردنی، لە قوڕگییەوە دەرنایەت.. ناتوانێ هاوار بکات: ئەمە لەکاتێکدا «عوسەکەڕ» لەدوواوە بەتەواوەتی خەریکی بوو.. کاری خۆی دەکرد.
یاسین هەر هاواری دەکرد و دەنگی لە قوڕگ نەدەهاتە دەرەوە.

جابیر جەنازەی باوکی یووسف دەیگوت «چۆن دەبێ شێرۆ مەدفەعی خوێڕی ئاوها بەئاسانی و بێ تۆژینەوە بەربدرێت!؟».
جابیر جەنازە بیری دەکردەوە، وەک مام شەریفی چایچیی گەراجە کۆنەکە، بچێ شێرۆ مەدفەع بکوژێ، بەڵام گومانی ئەوەی هەبوو کە نەوەک دەستی مەولوود مندالباز، یان دەستی «مەلا چاو بە کل» لە کارەکەدا هەبێت. وای بە باشتر دەزانی کە جارێ چەند ڕۆژێکی دیکەش چاوەڕێ بکات تا تۆژینەوەی پۆلیس و مەحکەمە دەگەنە ئەنجامێک.

بە کوڕەکەم گرتبوو.
جابیر جەنازە لێی پرسی:
– باشە، تۆ کوڕەکەی خۆت، کوڕەکەی خۆتت بۆچی کوشت؟ ئەو گوناهی چی بوو!
مام شەریف گریا، گوتی:
– ئەخلاقی تێک دابوو. متووی خۆی کردبوو.. تەنانەت لەگەڵی دەچووە حەمامیش.
مام شەریف نەیتوانی ئەم قسانەی خۆی تەواو بکا:
– من.. بەم.. دووابیە.. بۆم.. دەرکەوت...

---

عەقیلەخانی ژنی مام قادری قەیاغفرۆش لە ماڵی بەڵقیس خان دانیشتبوو، دڵی دەدایەوە و دەیگوت:
– ویش.. چاوم کوێر بێ بۆ یووسف!
بەڵقیس خان هەنسکی دەدا: «کچێ بەخوا منداڵی ئێمە ژیانیان لێ حەرام کراوە؛ کە گەورە دەبن.. کوێراییم دایە.. هیچیان نابێ بیگێڕنەوە».
– بەخوا نزاری منیش، بەڵقیس خان، باوکی ناهێڵێ لە کونی ژوورەوە بچێتە دەرەوە.
– نەیتوانی فێری زیڕنگەری یان پیشەیەکی باش ببێت، باوکی دەیگوت «ناوبازاڕ منداڵبازی لێیە»؛ نەیتوانی فێری مەلەکردن بێت، باوکی دەیگوت «مەسبەح منداڵبازی لێیە»؛ نەیتوانی ببێتە لاعیب و بۆ خۆی بچێ تۆپانێ بکات، باوکی دەیگوت «مەلعەب منداڵبازی لێیە»...
عەقیلە خان لەگەڵ بەڵقیس خانی دایکی یووسف هۆن هۆن دەگریا:
– چ بکەین، دایکم. بۆیە منداڵی ئێمە تا گەورەش دەبن، لە کەسابەت زیاتر هیچی دیکە نازانن چیە..! لە هەموو خۆشییەک مەحرووم..

جابیر جەنازە لەلایەن تۆژینەوەی مەحکەمە و بڕیاری پۆلیسەوە بۆی وەدیار کەوت کە مەولوود منداڵباز دەستی لە کارەکەی یووسفی کوڕی ئەودا نەبووە. لەمە بەتەواوەتی دڵنیا بوو، چونکە بۆ خۆیشی مهاجەی وەستا شەریفی چایچی کردبوو و لە دەمی مام شەریف چایچی خۆیەوە هەموو شتێکی بۆ ڕوون ببووەوە.
کەواتە ئێستا دوو ئیحتیمال ماوە: یان ئەوەتا شێرۆ مەدفەعە – کە یاسین زۆر گومانی لێ دەکا –، یانیش ئەوەتا «مەلا چاو بە کل»ی فڕنیچییە: چونکە کارەکە لەناو فڕنیەکەی ئەودا ڕووی داوە.
– ئاخر، ناشێ دوو ڕووداو لە یەک ساتدا لەناو هەمان فڕنیدا ڕوویان دابێ!
مام جابیر دەیویست لە مەبەستی حاکم بێوار باشتر حاڵی ببێت، گوتی:
– یەعنی چۆن؟
– ئێستا، ئەوا بەدیار کەوت کە ئەو منداڵەی لەناو فڕنییەکەی «مەلا چاو بە کل»دا تەعەددای لێکراوە، کوڕەکەی تۆ نەبووە: کوڕەکەی مام شەریفی چایچی بووە.
– ئێ..

- هەروەها ئەمەش بەدیار کەوت: مەولوود مندالّباز بووە کە تاوانەکەی ناو فڕنییەکەی کردووە.
جابیر جەنازە گوتی:
- ئەدی حەکایەتی کوڕەکەی من؟
- کوڕەکەی تۆ وا پێدەچێ هیچ پەیوەندییەکی بەو ڕووداوانەوە نەبێ کە لەناو فڕنییەکەدا ڕوویان داوە. ئێستا شتەکان خەریکن وردە وردە یەکلا دەبنەوە.
- بەڵام یووسفی کوڕی من ئەوا بۆ دووازدە ڕۆژ دەچێ بێ سەروشوێنە. دایکی ناردبووی بچێ لەو فڕنییە نەفرەتلێکراوە سەموون بکڕێت..
حاکم بێوار گوتی:
- بە هەر حاڵ، هەمووومان دەزانین: ئێمە بە تۆژینەوە لە چارەنووسی کوڕەکەی تۆ دەستمان پێکرد، کەچی گەیشتینە دۆزینەوە و ئەنجامی حەکایەتێکی دیکە..
جابیر جەنازە دیسان گوتی:
- حەکایەتی کوڕەکەی من؟
حاکم بێوار گوتی:
- بێگومان لەژێر تۆژینەوەدایە و جارێ هەر لێی دەکۆڵینەوە.
جابیر جەنازە گەیشتبووە تینی و نەیدەزانی چی

دووای ناشتنی تەرمی مەولوود منداڵباز لە قەبرستانە کۆنەکەی چراغ، پرسەکەیان هەر لە گەڕەکی تەیراوە لە مزگەوتی کوێتی بۆ بەستبوو.
قادر قەیماغفرۆش، لە یەکێک لە ڕۆژانی پرسەکەدا، بەرێککەوت جابیر جەنازەی باوکی یووسفی دیت. پێی گوت:
– جابیر دیتت! ئەگەر من و تۆ بمرین، ئەو هەموو ئەمین عام و بەرپرسە حزبی و پیاوماقوولەی حکوومەت دێنە پرسەمان؟
– مام قادر خۆ من دەمزانی: ئەو گەووادە لە ئیستیخبارات ئیشی دەکرد و بەکرێگیراوی بەعس بوو. دەمزانی.
مام قادر گوتی:
– بەخوا ئەگەر شێرۆ مەدفەعیش بمرێ، پرسەیەکی لەمە شکۆمەندتری بۆ دەگێڕن. ئەمە پرسەی وەزیرانە، باوکم، پرسەی منداڵبازان کەی ئاوها بووە؟

مام جابیری باوکی یووسف، ئەو عەسرە، چووە ماڵی مام هادی پەرەشووتی دراوسێی خۆیان. نەجیبەخانی خێزانی مام هادی بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکرد و دەیزانی بۆ مەسەلەی کوڕەکەی هاتۆتە لایان. جابیر جەنازە گوتی:
– نەجیبەخان، خۆ من دەزانم جەنابت گەواهیی خۆت لەلای پۆلیس داوە و تەواو.. ناشمەوێ لەمە زیاتر بەم گرفتەی خۆمانەوە لەمە زیاتر سەغڵەتت بکەم، بەڵام هاتووم تەنیا بۆ پرسیارێک.
نەجیبەخانی هادی پەرەشووت ڕوویەکی دراوسێیانەی گەش و هاوخەمانەی پیشان دا:
– ئەیەڕۆ، مام جابیر، ئەمە قسەیە تۆ دەیکەی! ئەمرکە!
جابیر جەنازە، گوتی: «خانم».
– بەڵێ.
– جەنابت، ئەو بەیانییەی ڕۆژی پێنجشەممە، بەسەر ڕووداوەکەدا چووبوویت.
–ئێ؟
– تکایە لە نووکەوە بۆم بگێڕەوە، چۆن بوو؟
– گوێ بگرە، مام جابیر!
– بەڵێ..

شوکرۆک، ژنە سەرشۆرەکەی حەمامی ژنانی تەیراوە، ئەو ڕۆژە بۆ دڵنەوایی هاتبووە لای پلکە بەڵقیس:
– پلکە بەڵقیس.. بەخوا هەموو خەڵک باسی ئەوە دەکەن: منداڵەکەی ناو ئەو فڕنییە یووسفی تۆ نەبووە.
– ئەدی؟!
شوکرۆک، مێردەکەی، کاتی خۆی لەگەڵ هەرەسی شۆڕشی ١٩٧٥، یەکسەڵەف تووشی جەڵتەی دڵ هاتبوو و لە ماڵەوە کەوتبوو، تەنانەت یەک تۆزقاڵیش چیە نەترسا بە ڕاشکاوییەوە بە پلکە بەڵقیس بڵێت:
– کوڕی تۆ، بەعس ڕفاندوویانە.
– کێ وا دەڵێ؟
– سوێندیان داوم ناوی ئەو کەسە نەدەم، بەڵام ئەو بەیانییە زووەی یووسف چووە سەموون بکڕێ، پیاوی بەعس و ئیستیخبارات هاتوون دەنێو ترومبێلێکی خۆیان ناوە و قەپاندوویانە.

بکا، وەک بیەوێ پێیان بڵێ «خۆم بەدووای تۆڵەسەندنەوەی خۆمدا دەچم»، گوتی:
– خێری پێوەیە ئینشاللا.
بێ خواحافیزی، چووە دەرەوە.

– من وەک هەموو بەیانییەک عەبام بەسەر خۆمدا دادا و بچم لە سەموونخانەکەی «مەلا چاو بە کل» سەموون بۆ منداڵەکان بکڕم. بۆ بەڵقیس خانیشم باس کرد. کاتێ گەیشتمە بەردەم سەموونخانەکە، تەنیا کوڕێکی گەنج لەپێش سەموونخانەکە وەستابوو، کوڕەکەی موعاون موفید. بەردەم سەموونخانەکە لە من و کوڕەکەی موعاون موفید زیاتر کەسی دیکەی لێ نەبوو. تازە گەرد و گوڵی بەیانی بوو، لەناکاو گوێم لە هێنکە هێنک و عەیب نەبێ ئاخ و ئۆفێک بوو. سەری خۆم دانوشتاندەوە خوارەوە بۆ شوێنی دەنگەدەنگەکە، لەژێر قەپەنگە چ ببینم!؟ ئەوەی خوا پێی ناخۆش بێ، ئەوەم دیت! ئەیەڕۆ، هەترەشم چوو. نەعرەتەیەکم کێشا و غارم دایە سەر جادەکە. استغفرالله. ئەوە یەکەم جارم بوو شتی ئاوها ببینم. لەو بەینەدا بوو، لەدووای منەوە، کوڕەکەی معاون موفید لەپێش فرنییەکەی «مەلا چاو بە کل»ەوە هاواری کرد:

– پۆلیس، پۆلیس.. خەڵکینە!

کاتێ لەگەڵ پۆلیس و خەڵکەکە هاتمەوە بەر دەرگای فرنییەکە، دەرگای ژوورەوەی فرنییەکە دادرابۆوە. کوڕەکەی موعاون موفید هەر دەیگوت:

- له ژووره‌وه‌ن، له ژووره‌وه‌..
- كێ؟
- پیاوێك.. له‌گه‌ڵ منداڵێك.
پۆلیسێك له منی پرسی:
- تۆش بینیت؟
گوتم: ئا، به چاوی خۆم دیم.
مام جابیر له نه‌جیبه‌خانی پرسی:
- منداڵه‌كه كراس و بێجامه‌یه‌كی خه‌تخه‌تی نارنجیی له‌به‌ر بوو؟
- بێحامه‌كه‌یم باش نه‌دیت، چونكه بێجامه‌كه‌ی هێنابووه خوارێ، به‌ڵام كراسێكی سپیی له‌به‌ر بوو.
مام جابیر دیسان پرسی:
- ئه‌و منداڵه‌ت قه‌ت له‌مه‌وبه‌ر دیتبوو؟ منداڵه‌كه‌ت ده‌ناسی؟!
- بیشیبینمه‌وه نایناسمه‌وه. ژووره‌وه تاریك بوو. نه‌متوانی باش بیانبینم كێن. به‌ڵام ده‌نگیان ده‌هات، بینیشمن: پیاوێك بوو، له‌گه‌ڵ منداڵێك.
- نه‌تده‌زانی پیاوه‌كه كێیه؟ كه‌سێكی چۆنه؟!
- نه‌متوانی پیاوه‌كه بناسمه‌وه، به‌ڵام منداڵه‌كه دیاربوو جوانكیله‌یه‌كی مووزه‌رد بوو.
- مووزه‌رد بوو؟

- بەڵێ.
مام جابیر گوتی:
- ئەو وەسفەی جەنابت دەیکەی، نەجیبەخان،، بە هیچ شێوەیەک پێ ناچێ کە ئەو منداڵە یووسفی ئێمە بێ!
- ئێ، نا.. نا. خۆ من بە بەڵقیس خانیشم گوت. یووسفی ئێوە مووزەرد نیە، جگە لەمەش، ئێوە دەڵێن کە ئەو بەیانییە، یووسف «کراس و بێجامەیەکی نارنجیی خەتخەتی لەبەر بووە». نەخێر، ئەو کوڕەی من بینیم، مووزەرد بوو، جگە لەوەش کراسێکی سپیی لەبەر بوو.
مام جابیر پرسی: «ئێ! پاشان...؟».
- پاشان ئیتر، ئەوە بوو: وردە وردە خەڵک لەبەردەم فڕنییەکەدا کۆبوونەوە و پۆلیس هات. کاتێ چوونە ژوورەوە.. کەسێ لێ نەمابوو.
- چۆن؟!
- نازانم.
- تۆ پێشتر منداڵەکە و پیاوەکەت لە ژوورەوە بینی. ها؟!
- بەڵێ. لەژێر قەپەنگەکەوە بینیمن.
- ئەدی باشە، پیاوەکە و منداڵەکە چییان لێ

هات؟

– نازانم.

– چۆن؟

– پۆلیس هاتن سەروخواری ناو فڕنییەکە گەڕان، نەیاندۆزینەوە. پۆلیسەکان دەیانگوت: بەسەربانەوە غاریان داوە.

– ئا.. ها! بە قاڵدرمەوە سەربانەوسەربان غاریان داوە.

– هەتا من گەیشتمەوە بەردەم فڕنییەکە، هیچ کامێکیان لەوێ نەمابوون.

مام جابیر لەناکاو لە نەجیبەخانی پرسی:

– نەجیبەخان، دەمەوێ ئەوەش بزانم: تۆ ئەو بەیانییە «مەلا چاو بە کل»ت دیت فڕنییەکەی خۆی بکاتەوە؟

– نەخێر.

– ئەدی کێ هاتووە فڕنییەکە بکاتەوە؟

– هەموو بەیانییەک کاتێ من دەگەیشتمە بەردەرگا، فڕنییەکە دەمێک بوو کرابووەوە. ئیدی نازانم..

مام جابیر گوتی:

– لەو دەمەدا پۆلیس چییان گوت؟

– سۆراغی خاوەنی فڕنییەکەیان دەکرد.
– «مەلا چاو بە کل» ؟
– بەڵێ.
– چییان دەگوت؟
– دەیانگوت «لەکوێیە؟ دەبێ بیدۆزینەوە!».
– ئەدی پاشان؟
– کاتێ زانییان «مەلا چاو بە کل» خاوەنی فڕنییەکەیە، گوێم لێ بوو یەکێکیان گوتی «لەوانەیە دەستی شاگردەکەی لەم کارەدا هەبێ».
– ئەدی خەڵکەکە چییان دەگوت؟
– ئەوانیش هەر ڕایان وابوو کە یەکێک لە شاگردەکان بووە.
مام جابیر گوتی: «هیچیان لە تۆ نەپرسی؟».
– با.
– گوتت چی؟
– چیم بۆ تۆ گێڕایەوە، ئەمەشم بۆ ئەوان باس کرد. من تەنیا ئەوەندەم ئاگا لێ بوو.
– تۆ هیچی دیکەت نەدیت؟
– هیچی وەک چۆن؟
– «مەلا چاو بە کل» ؟!
– من لەوێم نەدی.

– باشە، ئەو بەیانییە بۆچی خۆی پیشانی کەس نەداوە و هیچ کەس لەوێی نەبینیوە؟
– ماڵم قەبرە، من ئەمە نازانم.
– پۆلیسەکان چووبوونە ماڵیان. لە ماڵەوەش نەبووە.
لەکۆتاییدا، نەجیبەخان ڕووی کردە مام جابیر و دەیویست بە چرپەیەک پێی بڵێ:
– بەڵام مام جابیر، قسەیەکت پێ دەڵێم، با لە بەینی خۆمان دەرنەچێ!
– بەڵێ، فەرموو!
– سوێندم بۆ دەخۆی کە باسی ناکەی لە دەمی منەوەت نەبیستووە؟
– سوێند بێ بە گۆڕی دایکم!
– ئەمەم بە بەڵقیس خانیش نەگوتووە، ها! نەوێرام.
– دڵنیا بە! بیڵێ!
– تەنیا بۆ هادیم باس کردووە و تەواو! دوێنێ بۆم باس کرد. ئەویش ڕازی بوو پێتی بڵێم، بۆیە پێتی دەڵێم. مام جابیر..
– بەڵێ؟
– ئەو کوڕەی لەناو فڕنییەکەی مەلا چاو بە کلدا

ئەتک کراوە، کوڕی تۆ نەبووە.
– چۆن؟
– لەبەرئەوەی من کە فڕنییەکەم بەجێ هێشت و گەڕامەوە ماڵ، لەسەر ڕێگەی گەڕانەوەی خۆم بۆ ماڵەوە، یووسفی کوڕی تۆم بینی لەناو ئوتوومبیلێکی سپیدا بوو.. سێ پیاویشی لەگەڵدا بوو.
– یووسفی کوڕی من؟!
– بەڵێ. من یووسفی کوڕی تۆ باش دەناسمەوە. وەک کوڕی خۆم دەیناسمەوە. یووسف بوو، لەناو ئوتومبیلێکی سپیدا، لەگەڵ سێ پیاوی کەتەی ڕەشی ناشیرین. دەیانبرد..
– لەگەڵ سێ پیاو؟
– بەڵێ. کوڕی تۆ خەڵکی دیکە ڕفاندوویانە. «مەلا چاو بە کل» بێ تاوانە.
– نەتزانی ئەو سێ پیاوە کێ بوون؟
– نازانم. من تەنیا ئەوەندەم دیت.

قادر قەیماغفرۆش بە ڕۆستەمی گوت:
– لێرەوە هەڵتەک هەڵتەک منیان دیسان بانگ کردۆتەوە.. چیم لێ بپرسن باشە؟!
– چی؟
– وەڵا.. «مەلا چاو بە کل» بۆچی ئەو بەیانییە هاتبووە ماڵی ئێوە؟ نەعلەت لە ئەژداد و ئابائتان.. منداڵبازەکان بە واسیتە و واسیتەکاری بەردەدەن، خەڵکی وەکو من و «مەلا چاو بە کل»ی تێوە دەگلێنن.
ڕۆستەم لە خەڵک بیستبووی کە مام قادر قەیماغفرۆشی وەستایشی، کاتی خۆی ماوەیەک منداڵباز بووە. هیچ قسەی تێدا نەکرد، خۆی کڕ کرد.

عەقید عەلی، پلکە بەڵقیسی بانگ کردبووە پۆلیسخانەی تەیراوە، لێی پرسیبوو:
– پلکە بەڵقیس، یووسف کاتێ چووە دەرەوە هیچی پێ بوو؟
پلکە بەڵقیس یاسینی کوڕی خۆی لەگەڵ خۆی بردبوو، تاقەتی قسەی نەمابوو، بێزار، گوتی:
– هیچی وەک چۆن؟
– کتێب و کاغەز و شتی وا..
– کوڕی من چووبوو سەموونم بۆ بکڕێ.
عەقید عەلی گوتی:
– دەزانم دادە گیان، بەڵام .. باشە، پرسیارێکی دیکەت لێ دەکەم و بڕۆ!
– فەرمووو!
– تۆ هیچ بینیوتە یووسف مەنشووراتی پێشمەرگە و بڵاوکراوەی سیاسی لە ماڵی خۆتانەوە بباتە دەرەوە؟
پلکە بەڵقیس زەندەقی چوو:
– ئەیەڕۆ، دەتانەوێ بڵێن «یووسف موخەریب بووە»؟ دەتانەوێ ئەم جارە ئەوە بسەلمێنن کە کوڕی من لەگەڵ پێشمەرگە کاری کردووە؟
پلکە بەڵقیس کاتێ هاتەوە ماڵ، ئەم قسانەی بۆ

«جەمال سێوان» پیاوێکی زۆر بەنەزاکەت، بەڵام دڵی بە منداڵان دەکرایەوە و هەمیشە حەزی دەکرد لە مەلعەب و مەسبەح و ئەو شوێنانەی منداڵ و هەرزەکار و گەنج تۆپانێیان لێ دەکرد بچێ ڕاوەستێت و تەماشای چەهرە و قاچ و قولیان بکات: زۆر عاشقی جوانیی کوڕ و کاڵان بوو. بۆیەش برادەرە تورکمانەکانی خۆی کە پێکەوە ئێواران لە چایخانەی «کۆترسەلام» کۆدەبوونەوە ناویان نابوو «جەمال سێوان».

جەمال سێوان خزمی مام جابیری باوکی یووسف بوو: باوکیان ئامۆزای یەکتر بوو، بەڵام مام جابیر – سەبارەت بەو قسەیەی بەدووایەوە بوو– حەزی نەدەکرد هێند هاموشۆی بکات و بە خزمی بزانێ.

جەمال سێوان درەنگ بە کارەساتەکەی یووسفی زانیبوو: ئەو ئێوارەیە دەمودەست سەردانێکی مام جابیری کرد و پێی گوت: «هەر ئەمرێکیشت هەبێت لە خزمەتم مامە گیان».

مام قادری قەیاغفرۆش، لە غودبەی ڕۆژی هەینی دەهاتە دەرەوە، حاجی بەدرەدین جامچی دراوسێیان بوو، پێکەوە دەگەڕانەوە ماڵەوە، زۆر بێهوودانە لە مام قادری پرسی:

– ئێستا ئەوا مەولوود منداڵباز کوژرا، شێرۆ مەدفەعیشیان بەردا.. هەر «مەلا چاو بە کل» لە ژوورەوە ماوە. مەسەلە چیە؟! کاری حکوومەت زۆر سەیرە. ها!

– ئەدی ئەوە دوو جارە بانگم دەکەنەوە. بلێ چیم لێ دەپرسن!

– چی؟

– دەڵێن مەلا چاو بە کل بۆچی ئەو بەیانییە زووەی ڕۆژی پێنج شەممە «ڕای کردۆتە» ماڵی ئێوە؟

– ئێ، گوتت چی؟

– گوتم چی؟ گوتم ««مەلا چاو بە کل» لە هیچ شوێنێکەوە ڕای نەکردۆتە ماڵی من. «مەلا چاو بە کل»ی بەستەزمان کۆنە هاوڕێمە، چەندین ساڵە دەیناسم. زۆربەی بەیانیانی پێنج شەمموان کە لە قورئانخوێندنی سەر قەبران، لە قەبرستانی شێخ مەلا ڕەشیدەوە دەگەڕێتەوە، دێ قاوڵتیی بەیانی لە ماڵی ئێمە دەکا.

جابیر جەنازەی مێردی دەگێڕایەوە و دەگریا، دەیگوت:

– کەواتە شوکری سەرشۆر ڕاستی دەکرد. قوڕم بەسەر.. وەیش...

– چیی دەگوت؟

– دەیگوت: «یووسفی کوڕی تۆ، بەعس ڕفاندوویەتی. گیراوە».

«جەمال سێوان» هەمیشە قەرەوێتێکی ڕەنگینی دەبەست و گوڵێکی لە یەخەی خۆی دەدا. بۆ دۆمینە و تاوڵەکردن لەگەڵ ئەربابەکانی خۆی، لە چایخانەی کۆترسەلام، هەندێ جاریش لە چایخانەکەی مام سەدرەدینی لۆبیافرۆش دادەنیشت.
ئەم پاش عەسرە، لەگەڵ قادر قیرۆی خاڵی یووسف، لە چایخانەکەی کۆترسەلام، پشتیان دابووە دوو کورسی و ڕووەو شەقامە ئاپوورەکە دانیشتبوون باسی مەسەلەی بێ سەروشوێنیی یووسفییان دەکرد.
جەمال سێوان بنعامی مام جابیر، قادر قیرۆش کوڕە خەزووری مام جابیر، هەردووکیان خۆیان بە هاوخەمی مام جابیر دەزانی:
– وەڵا ئافەرین بۆ رائید نەعیم، نەیهێشت براکەی لە دوو شەو زیاتر لە حەپسخانە بمێنێتەوە.
جەمال سێوان گوتی:
– تۆ پێت وایە شێرۆ مەدفەع دەستی لە مەسەلەی یووسفدا هەبێ؟
– یووسف بێ سەروشوێنە، ئەمە مانای وایە کە «دەستێکی گەورەتر» لە کارەکەدا هەیە.
– بەڵام ئەم دەستە گەورەیەش هەر بەبێ هاوکاریی شێرۆ مەدفەع نەبووە.

حاجی بەدرەدین جامچی گوتی:
– مام قادر شتێکت پێ بڵێم، باوەڕم پێ دەکەی؟
– بەڵێ..
– برا گەورەکەی «مەلا چاو بە کل» شەش مانگێکە چووە بۆتە پێشمەرگە، دەیانەوێ بەم تۆمەتە ناوی «مەلا چاو بە کل» و برا پێشمەرگەکەی لەلای خەڵک بزڕێنن.
مام قادر بیری دەکردەوە، گوتی:
– ڕاست دەکەی!
پاشان گوتی:
– بۆیەش ئەو هەموو شێر و ڕێوییە بۆ ئەو بەستەزمانە دەهێننەوە.
– بەبیرتە: هەر لە سەرەتاوە هەر خۆشیان ئەوەیان بڵاوکردەوە کە «مەلا چاو بە کل» لەسەر کارێکی ئاوها گیراوە!

شێرۆ مەدفەع بە سەلیم شەمووڵەی کەنناس دا خەبەری بۆ مام جابیری باوکی یووسف ناردبوو: ««مەلا چاو بە کل» بووە کە یووسفی کوڕی جەنابتی ئەتک کردووە، نەک من».
— چیی دیکەی گوت؟
سەلیم شەمووڵەی کەنناس گوتی:
– هەر ئەوەندەی گوت و سەلامیشی لێت دەکرد، دەیگوت: «من ملم لە مووی باریکترە. با مام جابیر بزانێ: من بێ تاوانم» .

شـێـرۆ مـەدفـەع لەگـەڵ قلەكـەی خـۆی، لە چابخانەكەی بەرامبەر سینەما سیروان، لەگەڵ تاهیر تەسبیح و قادر قەنینە دانیشتبوون پۆكەریان دەكرد.
شێرۆ مەدفەع گوتی:
– مەلا چاو بە كلی منداڵباز هەتا چوار ساڵ پێش ئەمـڕۆش منداڵی گـەڕەكی بەزۆری و زۆردارەكی دەبردە ناو فرنییەكەی خۆیەوە، ئێستاش، لەوەتەی برا گەورەكەی لە عەسكەری غاری داوە و چووە بۆتە پێشـمەرگە، لێمان بووە بە مەلا و دەچێ قورئان لەسەر گۆڕی مردووان دەخوێنێ. دەیەوێ بەم درۆ و دەلەسەیە ڕووی خۆی لەناو خەڵك سپی بكاتەوە.
كەریم كەرگێ پێكەنی، گوتی:
– وەلحاصل تۆ ئەو چەند ڕۆژە لەناو مەخفەری تەیراوە، باجی مەلا چاو بە كلت دایەوە.
قادر قەنینە بیللییەكەی فڕێ دایە سەر مێزەكە:
– گوێی مەدێ! دەی.. سەرفیترە بوو، داتە «مەلا چاو بە كل».
كەریم كەرگێ گوتی:
– بەخـوا ئەو گـەوادە زەكـاتیـشی پێ بەڕەوا نابینرێ.
شێرۆ مەدفەع گوتی:
– دایكی یووسف دەیگوت: «ئیستیخبارات و ئەمنی بەعس ڕفاندوویانە».
– بە ڕای من: «منداڵباز» قەپاندوویانە.
قادر قیرۆ گوتی:
– ئەرێ بەڕاست، ئەو خوێڕییە، بۆچی پێی دەڵێن «شێرۆ مەدفەع». ئەم مەدفەعەی بۆچی پێوە لكاوە؟
جەمال سێوان، هەر بەچرپە، گوتی:
– ئەوە كاتی خۆی، بووە جاشی حكوومەت و بە گژ پێشمەرگاندا چوو. پاشان نەعیمی برای كردی بە ئامیر مەفرەزەی جاشان: بۆ خۆی لەسەر مەدفەع بوو، بۆ ماوەی سێ مانگان هەر لەسەر مەدفەع مایەوە، لە چوار پێنج شەڕوشۆڕی زۆر گەورە لە مێرگەسۆر و ناوچەی لۆلان كوشتارێكی زۆری پێشمەرگانی كرد. ئێستاش هەر معاشی جاشایەتی وەردەگرێت و بە خۆی و بە براكەی جاسووسی بۆ حكوومەت دەكەن.
– هەقیەتی پێی دەڵێن «شێرۆ مەدفەع».

بەڵقیس خانی دایكی یووسف، لە دوێنێوە، لەناكاو تایەكی قورسی گرتبوو: لەناو جێ كەوتبوو. مام جابیر داوای لە نەسرینی كچە پارچەڵەكەی خۆی كرد كە ئەم یەك – دوو ڕۆژە هەتا دایكی چاك دەبێتەوە نەچێتە مەكتەب و لەلای دایكی بێت.

– له ئەو زیاتر، قادر قەیاغفرۆش.. داخی زۆری له دڵمایە.
– ئەو چیی کردووە؟
– لەناو خەڵک وا بڵاوی دەکاتەوە کە «مەلا چاو بە کل» لەسەر کوردایەتی گیراوە.
کەریم کەرگێ گوتی:
– بەڵێ، کە تۆش لە ژوورەوە بووی، لەناو خەڵک وای بڵاو دەکردەوە کە یووسفی کوڕی مام جابیر تۆ پەندت پێی داوە.
– هەر چۆنێک بێ، دەیانەوێ تاوانی یووسف بخەنە پاڵ تۆ.
شێرۆ مەدفەع کوڕێکی فڕێ دا و گوتی:
– شەرت بێ بە «جەمیل دۆخین» بڵێم: کوڕەکەی ئەویش بە پەندێک ببات، سەرشۆڕی ناو هەموو مەجلیسێکی بکات.
نەوزاد پەمۆ، چواردە ساڵان، قلی شێرۆ مەدفەع، (کە لە تەنیشت خۆیەوە داینیشاندبوو) گوتی:
– ئنجا ئەمەی بۆ چیە؟ بە ڕائید نەعیمی برات بڵێ: فڕێی بدەنە زیندانی ئەبووغرێبەوە و تەواو.

یاسین لەگەڵ یووسفی برای، وا ڕاهاتبوون زۆربەی ڕۆژانی دووشەمووان پێکەوە بچنە مەسبەح. ئەمڕۆ ئەوەتا دیسان دووشەممەیە و یووسف دیار نیە! یاسین لەگەڵ کێ بچێتە مەسبەح؟
ئەمڕۆ، ئێستا، بەتایبەتیش لەم دەمودەستەدا، یاسین بەڕاستی غەریبیی یووسفی برای خۆی دەکرد. لەژوور سەری دایکی دانیشتبوو، هەستی بە تەنیایی و فیگارییەکی پڕ سوێ دەکرد: هۆن هۆن دەگریا.

قادر قەیاغفرۆش دەیویست بە ڕۆستەمی شاگردی خۆی بڵێ: «حزبی بەعس دەیەوێ بە بەردێک سێ چۆلەکە بکوژێ».
ئەگەر مام قادر بوێرایە ئاوهای پێ بڵێ، شاگردەکەیشی دەیگوت: «چۆن؟».
ئەویش دەیگوت:
– دەیانەوێ مەلا چاو بە کل و برا پێشمەرگەکەی لەپێش چاوی خەڵک ڕیسوا بکەن، ئنجا دەشیانەوێ لە حەپسخانە قسە لەبارەی برا پێشمەرگەکەی وەربگرن، لە هەمان کاتیشدا یووسفی کوڕی مام جابیر بە ناوی بێ ئەخلاقییەوە بخەنە زیندانەوە.
ئەوکاتەش بێگومان شاگردەکەی دەیپرسی:
– یووسف بۆچی دەخەنە زیندانەوە؟
ئیدی ئەوکاتە مام قادر ناچار دەبوو هەموو شتێک بدرکێنێت و بڵێ:
– چونکە ئەویش گومانیان لێ هەیە، گوایە لەگەڵ ڕێکخراوەکانی پێشمەرگە کاردەکات و مەنشووران لەناو شاردا بڵاودەکاتەوە.
بەڵقیس خانی دایکی یووسف، دوێنێ، بۆ عەقیلەخانی ژنی مام قادر گێڕابوویەوە کە بانگیان کردووە و پێیان گوتووە کە یووسفی کوڕی،

«جەمال سێوان» ناوی ئەکرەم بوو، جابیی ئامانە، لەگەڵ مام جابیری باوکی یووسف باوکیان ئامۆزای یەکتر بوو. ماوەیەک بوو ساردییەک لەنێوانیاندا هەبوو، بەڵام ئەوەتا ئەمڕۆ کاتێ دیتی مام جابیر لەگەڵ یاسینی کوڕە گەورەکەی بۆ پرسەی سەعۆی برای هاتوون، هەستی بە دڵدانەوە و بەختەوەرییەکی زۆر کرد.

جەمال سێوان بە مام جابیری گوت: «پێتانەوە سەربڵند بووم، مامە».

ئنجا گوتیشی:

– بەڵێن بێ: کە تەعزیەکەمان تەواو بێت، یووسف لە بنی دنیاش بێت.. بۆت دەدۆزمەوە».

جابیر جەنازە، خۆی و یاسینی کوڕی، دووای ئەوەی پێکەوە چوونە مزگەوتی شێخی چۆلی: فاتیحەیەکیان بۆ پرسەی سەعۆی برای جەمال سێوان خوێند، هەر پێکەوە بەرەو چایخانەکەی مام سەدرەدینی لۆبیافرۆش ڕۆیشتن: ئەو جێیەی کە شێرۆ مەدفەع و هاوڕێکانی خوویان پێوە گرتبوو تێیدا دانیشن. مام جابیر چایەکەی تێک دەدا، بە شێرۆ مەدفەعی گوت:

– تۆ چ بەڵگەیەکت هەیە کە دەڵێی «مەلا چاو بە کل» دەستی لەم کارەدا هەیە؟

شێرۆ مەدفەع گوتی:

– مام جابیر، تۆ خۆشت دەزانی: «مەلا چاو بە کل» هەتا چەندساڵێک پێش ئێستاش هەر منداڵباز بوو، بە هەمووی چەند ساڵێکە خۆی لێمان کردۆتە مەلا. پاشان ئاشکرایە: ڕووداوەکە لەناو فڕنییەکەی ئەودا ڕووی داوە.

مام جابیر گوتی:

– ئەو منداڵەی ناو فڕنییەکە کوڕی من نەبووە.

شێرۆ مەدفەع گوتی:

– تۆ بۆچی بیر لەوە ناکەیتەوە کە هەر دوو ڕووداو بەیەکەوە و لە یەک کاتدا ڕوویان دابێ؟

مەنشووراتی بەناو شاردا بڵاوکردۆتەوە و بۆ پێشمەرگە کار دەکات.

مام قادر چەندی دەیکرد و دەیکرد: نەیدەوێرا ئەم قسەیە لای شاگردەکەی خۆی باس بکات.

- چۆن یەعنی؟

- یەعنی مەولوود منداڵباز مەژغوولی کوڕەکەی وەستا شەریفی چایچی بووبێت و مەلا چاو بە کلیش دەستی نابێتە بینی ئەو کوڕە بەستەزمانەی تۆ!

مام جابیر یەکسەر کەوتە بیرکردنەوە بۆ ئەوەی باوەڕ بە قسەکەی شێرۆ مەدفەع بکات. بە هەمان شێوە، یاسین، کە لەتەنیشت باوکی دانیشتبوو: بەترس و سامێکەوە تەماشای شێرۆ مەدفەعی دەکرد. مام جابیر گوتی: یەعنی ڕێککەوتن؟

شێرۆ مەدفەع گوتی: بەڵێ.

- هەردووکیان لەناو هەمان فڕنیدا؟

- بەڵێ.

ئنجا شێرۆ مەدفەع گوتی:

-چونکە تۆ بیر بکەوە: «مەلا چاو بە کل» ئەو بەیانییە، پۆلیس هەموو دنیایان لەدووای کردووە، نەیاندۆزیوەتەوە. ئەو بەیانییە کەس نازانێ لەکوێ بووە! بە درۆی خۆی و بە درۆی مام قادری قەیماغفرۆش کە ئەویش هەر کاتی خۆی منداڵباز بووە و کۆنە هاوڕێی خۆیەتی: گوایە ئەو بەیانییە لە ماڵی مام قادری قەیماغفرۆش بووە. باشە، پێم بڵێ:

«مەلا چاو بە کل» بەو بەیانییە زووە لە ماڵی مام قادر چی دەکا؟! مەعقوولە خەڵک بەیانییان کاتژمێر شەشی بەیانی بچێ سەردانی ماڵە برادەرێکی خۆی بکات؟ ماقووڵە؟! پاشان شتێکی دیکەش!

– بەڵێ.

– مەولوود مندالّباز خۆی پێی گوتم. بەڕەحمەت بێ! من دەبێ بیدرکێنم..!

– چی؟

– من، مەولوود خۆی پێی گوتم؛ بەیەکەوە کارەکەیان کردووە.

– مەولوود لەگەڵ کوڕەکەی وەستا شەریف؛ مەلا چاو بە کلیش لەگەڵ کوڕەکەی من؟!

– بەڵێ. شاگردەکەی مەلاش لەگەڵیان هاودەست و هاوکار بووە.

جابیر جەنازە گوتی:

– بەڵام شاگردەکەی «مەلا چاو بە کل» دەڵێ کە مەولوود مندالّباز بەزۆری داوای لێی کردووە ئەو بەیانییە فڕنییەکەی بۆ چۆڵ بکات.

شێرۆ مەدفەع گوتی:

– بۆی چۆڵ نەکردووە، بۆی ئامادە کردووە.

دەبینی! تۆ بیری لێ بکەوە: شاگردەکەی «مەلا چاو بە کل» ئەو بەیانییە لەوێ بووە! شاگردە فڕنیچییەک چۆن دەتوانێ فڕنییەکی گەورە و گران بۆ منداڵبازێک چۆڵ بکات ئەگەر وەستایەکەی خۆی ڕازی نەبێت! تۆ بیر تەنیا لەمە بکەوە و بەس.. ئیتر دەمودەست تێدەگەی کە دەستی «مەلا چاو بە کل» لە کارەکەدا هەیە.

جابیر جەنازە گوتی:

– شاگردەکە دەڵێ: «مەولوود منداڵباز بەزۆر کارەکەی پێ کردووم و هەڕەشەی کوشتنی لێکردووم».

– نەخێر. شاگردەکە بە ئەمری مەلا چاو بە کلی وەستای خۆی، کارەکەی کردووە. تەماحییان داوەتێ و لەگەڵ خۆیان هاودەست و هاوکار بووە.

جابیر جەنازە دەمودەست لێی پرسی:

– تۆ ئامادەی کە لای پۆلیس ئەم ئیفادەیە بدەی؟

– بێگومان، چونکە شاگردەکەی «مەلا چاو بە کل» درۆ دەکا.

یاسین و باوکی ڕوویان کردە یەکتر و بیریان دەکردەوە. یاسین گوتی:

– ئەوە بۆیەش «مەلا چاو بە کل» و شاگردەکەیان

هێشتا هەر بەرنەداوە.
جابیر جەنازە، بێ ئەوەی بیەوێ، تەماشای وێنە هەڵواسراوەکەی «صدام حسین»ی کرد کە بە قەد دیواری چایخانەکەوە هەڵواسرابوو؛ پاشان لە دڵی خۆیدا، کەمێک سەرلێ شێواو، نائومێدانە گوتی: نازانم بە کێ بڕوا بکەم!؟

جەمال سێوان دووای تەواوبوونی ڕۆژی پرسەکەی سەعۆی برای بە ڕۆژێک، بەبێ ئاگاداریی مام جابیری ئامۆزای باوکی، چووبووە لای مام قادری قەیماغفرۆش.. لێی پرسیبوو:
- مام قادر، تۆ پێت وایە کە شێرۆ مەدفەع دەستی لە ئەتک کردنی یووسفی بنعامی باوکم هەبێ؟
مام قادر کە هەمیشە زەندەقی لەم جۆرە پرسیارانە دەچوو، گوتبووی: «نازانم. الله اعلم..

خوشکی مەلا چاو بە کل (بەهیەجەخانی ژنی ئەنوەر کۆترباز) پاش عەسرێک هات سەردانێکی پلکە بەڵقیسی دایکی یووسفی کرد.
دوێنێ لە حەمامی ژنانی ٧ی نیسان، لە ژنی سابیر سەیدۆکی دراوسێیانەوە بیستبووی کە بەڵقیس خان تەندروستیی تێکچووە و لە داخی یووسفی کوڕی خەریکە سەردەنێتەوە. ئەویش پێی شوورەیی بوو نەچێ (ئەو لەگەڵ بەڵقیس خان، لە زەمانی کچێنیی خۆیاندا، بۆ ماوەی دوو ساڵان لە گەڕەکی خانەقا هاوماڵ بوون، کرێچیی یەک ماڵ بوون. تەنانەت قاپ و قاچاغی یەکتریشیان بەکاردەهێنا. بۆ یەکتر لە خوشکیش زیاتر بوون) گوتی: با لەسەر دڵم نەبێتە گرێ و بچم سەردانێکی بکەم، خۆ قابیلە دەرم بکەن؟
بەهیەجەخانی ژنی ئەنوەر کۆترباز، لە چاک و چۆنی و هیوای چاکبوونەوە زیاتر بۆ بەڵقیس خان، هیچی دیکەی باس نەکرد.. بەڵام کاتێ بەڵقیس خان خۆی قسەی کردەوە، بەهیجەخان گوتی:
- بە قوربانی یووسف بم! بەخوا بەقەد چاوی خۆمم خۆش دەوێ. هیچی لێ نەهاتووە ئیشاڵڵا. بەخوا مەغدیدیش، بەڵقیس خان، خۆ تۆ دیبووت و

دەتناسی، قەت پێم وا نیە کاری ئاوهای لێ بوەشێتەوە. پیاوێکی کاسب، قورئانخوێن، بەخوا سەری بچووایە نوێژی نەدەچوو. ئەدی خوشکم! ئەگەر ژنی هێنابایە، قەت ئاوها ئەمڕۆ لێی دەکەوتنە گومان! هەموو جار پێم دەگوت، دەمگوت:

– ولەن مەغدید، بیر ئەرواد ئاڵ ئۆزووچی!

لێم تووڕە دەبوو، دەیگوت:

– سەن ناوودی؟ ئەرواد، ئەرواد..؟! ئەرواد ئیستەمام. گێت!

دەمگوت: «مەغدید، سەن مانم قەرداشمسەن. عەلام ئیستووە سێلاشری. هەر بیر حەکاتدە خەنجەر کیمندی. قەرداشم، بیر ئەرواد ئاڵ ئۆزووچی!

پێی دەگوتم:

– وازگێت! ئەرواد ئیستامرەم.

ئیستامرەم، ئیستامرەم.. تووشی ئەم بەزمەی کرد: خەڵک لێی کەوتنە گومان و ئەوەتا.. بێ هیچ تاوان و گوناحێک دوو هەفتە زیاترە لە ژوورەوەیە! باشە، بەڵقیس خان، من تێناگەم: ئەدی ناڵێن ئەو کوڕەی فڕنییەکەی کاکم، یووسف نەبووە؟

بەڵقیس خان، نەخۆش، هەر لەناوجێ، سەری ڕاوەشاند:

«جەمال سێوان» تازە سەعۆی برا گەورەکەی، لە بەردەم موحافەزە، لەگەڵ شازدە فیراری عەسکەریی دیکە، ڕەمی کرابوو: لە قادسیەی صەدام فیراریان کردبوو و نەگەڕابوونەوە سەرپۆلی زەهاو.
جەمال سێوان دڵی زۆر پڕ، چوار ڕۆژ بوو تازیەیان تەواو ببوو؛ ئەمە دووەمین ڕۆژ بوو هاتبووە دەرێ. لەگەڵ عوسمان توورگە و تاهیر تەسبیح و تەها قوزێ لە چایخانەکەی مام سەدرەدینی لۆبیافرۆش لە گەڕەکی تەعجیل دانیشتبوون دۆمینەیان دەکرد.
جەمال سێوان، گوتی:
– ئەدی بەبیرتان نیە وەختی خۆیشی کوڕەکەی داود دۆغرەمەچییشیان برد و لە زیندانی ئەبووغرێب ڕزاندیانەوە و گوتیان «پێشمەرگە قەپاندوویانە»!
تاهیر تەسبیح دەیزانی جەمال سێوان سەبارەت بە ڕەمی کرانی سەعۆی برای، لە حکوومەت پڕە و بەردەوام جنێو بە قادسیەی صەدام دەدا.. خۆی کڕ کرد. عوسمان توورگە گوتی:
– بەخوا ڕاست دەکەی.
تەها قوزێ ناواخنی قسانی گۆڕی، گوتی:
– مەوالیدی ئێمەش نزیک بۆتەوە جەماعەت!
جەمال سێوان درێژەی بە قسەکانی دا و جەختیی

مودیری ئەمنی بەلدەی تەیراوە یاسینی بانگ کردبووە ئەمنی بەلدە. ڕێزێکی زۆریان لە یاسین گرتبوو، بە قسەی خۆش لێیان پرسیبوو: ئاخۆ یووسفی برای قەت بڵاوکراوەی پێشمەرگانی لە شاخەوە بۆ دەهات؟ ئاخۆ یاسین هەرگیز بینیویەتی ئەگەر پەیوەندیی هەبوویێت بە «مخربین» و حزبە چەکدارەکانی شاخ؟!
کاتێ یاسین ئەم قسانەی بۆ باوکی گێڕایەوە، باوکی – دووای بیرکردنەوەیەک – بە یاسینی گوت:
– باش، تێگەیشتم!
پاشان گوتی:
– ئەم قسانە بۆ دایکت نەگێڕیتەوە. دەترسێ.

– با.
– ئەدی کاکم بۆچی هێشتا هەر بەرنەدراوە؟ ئەدی نالێین مەولوود منداڵباز بووە؟
کچە پارچەڵەکەی بەڵقیس خان بە قسە هات:
– مەولوود منداڵباز لەگەڵ کوڕی وەستا شەریفی چایچیی بووە..
بەڵقیس خان پشتەدەستێکی لە دەمی کچە پارچەڵەکەی خۆی دا:
– وس کچێ! تۆ وس بە!
بەڵقیس خان ڕووی کردەوە بەهیجە خان:
– بەردەبێ، بەردەبێ ئیشاڵڵا.. بەهیجە خان.
بەهیجە خان گوتی:
– ئەدی دەڵێین: یووسف خۆیشی گیراوە؟
کچە پارچەڵەکەی بەڵقیس خان، لەناکاو هەستایە سەرپێ، بەدەم گریانەوە هاواری کردە سەر بەهیجە خان و هەڕەشەی لێکرد:
– بەهیجە خان دایکم نەخۆشە. ئەویش بە خەفەتان مەکوژن. وازی لێ بێنە توخوا..!
خوشکە تاقانەکەی یووسف ئەم قسانەی کرد و چووە دەرەوە.

کردەوە:
– کوڕی جابیر جەنازەی بنعامی منیش هەر حکوومەت گرتوویەتی.
پاشان گوتی:
– مەلا چاو بە کلی بەستەزمانیش بە هەمان شێوە. ئاشکرایە: کاکۆی برای مەلا چاو بە کل پێشمەرگەیە، بەعس دەیەوێ لەپێش خەڵک ئابڕوویان ببەن، ئابڕووی مەلا چاو بە کل و ئابڕووی کاکۆی برایشی.. چونکە پێشمەرگەیە.
تاهیر تەسبیح گوتی:
– باشە، کوڕی جابیر جەنازە پەیوەندیی بە سیاسەتەوە چیە؟ ئەو منداڵە چ لە سیاسەت دەزانێ، تا بیگرن؟
عوسمان توورگە گوتی: «با».
– چۆن؟
– دەڵێن «مەنشووراتیان لەدەست گرتووە و لەگەڵ پێشمەرگان کاردەکا».
– یووسف؟
– بەڵێ.
جەمال سێوان گەمەی بە زنجیری سەعاتەکەی خۆی دەکرد، گوتی:

– دەیانەوێ بە بەردێک دوو چۆلەکە بکوژن.
– چۆن؟
– یووسفی کوڕی مام جابیر لەکۆڵ بکەنەوە و ئابڕووی «مەلا چاو بە کل» و برا پێشمەرگەکەشی ببەن.
جەمال سێوان کە ماوەیەک بوو لای عوسمان توورگە دەیگوت: «لە ڕقی حکوومەت دەچم دەبمە پێشمەرگە»، لەسەر مێزی دۆمینەکەوە تەماشایەکی تەهای کرد و گوتی:
– جەماعەت، ئەم قسانە لە بەینی خۆمان بێ: تکایە نەگاتەوە شێرۆ مەدفەع. برای شێرۆ لە ئیستیخباراتە.. با تووشی چورتمێکمان نەکا.

یاسین پێی وابوو مندالبّاز یووسفیان ڕفاندووە نەک حکوومەت، چونکە بیری دەکردەوە: یووسف هیچ پەیوەندییەکی بە سیاسەتەوە نەبووە. یووسف هەرچی شتێکی لەم جۆرەی هەبووایە، راشکاوانە یاسینی برای گەورەی ئاگادار دەکردەوە و پێی دەگوت . تەنیا جارێکیان نەبێ، دوو مانگ پێش کارەساتەکە، یووسف بە چرپە بە یاسینی گوتبوو:
– جوامێری پۆلەکەی ئێوە داوامی لێکرد بچین پێکەوە مەنشووراتی پێشمەرگان لەناو سینەما سەلاحەدین بلاوبکەینەوە.
یاسینیش لێی پرسیبوو:
– چووی؟
یووسف گوتبووی: «بەڵێ».
یووسف ئامۆژگاریی کردبوو:
– جارێکی دیکە کاری وا نەکەی!
یاسین دلنیا بوو کە یووسف هەمیشە گوێڕایەڵی یاسینی برای بوو، لە قسەی ئەو نەدەچووە دەرەوە و ئەم جۆرە کارانەی بەبێ ئیزنی ئەو نەدەکرد.
نەخێر، یاسین باوەڕی نەدەکرد کە یووسف چووبێتە ڕیزی هیچ حزبێکەوە. تەمەنیشی هی ئەوە نەبوو هیچ حزبێک بە ئەندامەتی وەری بگرێ.

بەڵقیس خانی دایکی یووسف لەناو جێگا کەوتبوو، دوو لێفەیان پێ دادابوو. چارۆگە سپییەکەی بەسەر نێوچەوانییەوە، تەسبیحە سەد و یەک قلییەکەیشی لە تەنیشتییەوە کەوتبوو. دەوراندەوریشی هەمووی ژنی گەڕەک بوون: دایزە ویدادی ژنی بەدرەدین قەرە، دادە نەزیهەی ژنی مەحموود خۆخێ، پلکە بەدۆکەی نانکەر، ئامینەخانی ژنی عەبدۆک نەجار، خەجەبازاڕی لیفکەدرووی گەڕەک، لەگەڵ ژنە گەورەکەی عوسمان سەقای ئامۆزای.. هەموویان، دەتگوت لە پرسەیەک دانیشتوون.. دڵیان دەدایەوە.
بەڵقیس خان، بەو نەخۆشی و نەساغییەشەوە هەر دەگریا و دەلالایەوە:
– بە قوربانی بم! یووسف، جوانییەکەی خۆی بوو.. سەری خۆی خوارد!

یاسین گومانی زۆرتر لە تاهیر تەسبیح دەکرد، چونکە بەبیریەتی:
جارێکیان لە مەسبەح، لەگەڵ یووسف، پێکەوە چووبوونە ناو ئاوەکەوە. ئەو تاهیر تەسبیحە لەناو ئاوەکە لەگەڵیان بوو. لەناکاو یووسف هاواری لێ هەستابوو، کاتێ یاسین هەر لەناو ئاوەکەوە بە مەلە ڕای کردبووە لای یووسف، یووسف خەریک بوو ببووریتەوە. یاسین بەپەلە یووسفی هێنابووە دەرەوە و لێی پرسیبوو: «چی بوو؟» یووسف گوتبووی: «تاهیر تەسبیحی خوێڕی بوو» «چیتی لێ کرد» «بە هەر دوو ناولەپی، ئاوی پرژاندە ڕوومەوە و پاشان بە هەر دوو دەستی لەژێر ئاوەکەوە هەر دوو لاڕانمی گرتبوو» «چیتی لێدەکرد؟» «بە هەر دوو دەستی، توند توند لەژێر ئاوەکەوە ڕانمی دەگوشی».
یاسین بەبیریەتی: لەو ڕۆژەوە ئیتر جارێکی دیکە نەچوونەوە مەسبەح؛ هەر بۆیەش یووسفی برای نەیتوانی فێری مەلەکردن ببێت و تەنانەت مەسبەحیشی لەپێش چاو کەوت.

قادر قەیماغفرۆش لە ڕۆستەمی شاگردی خۆی پرسی:
– تۆ مەوالید چەندی، ڕۆستەم؟
– شەست و یەک.
– جارێ ماوتە.
ڕۆستەم بە پارچە پەڕۆیەک تەرازووەکەی پاک دەکردەوە، پرسی:
– لەبەرچی لە مەوالیدی منت پرسی، مام حاجی؟
مام قادر ئەگەر بیگوتبایە:
– دوێنێ لەناو مەعەسکەری هەولێر بەبەر چاوی یەک دونیا خەڵکەوە هەشت کەسیان گوللەباران کردووە.
ڕۆستەم دەیپرسی:
– بۆچی؟
ئەوساتە ئەمیش ناچار دەبوو بڵێ:
– عەسکەری فیرار بوونە.
ڕۆستەمیش ئەوکاتە دەیگوت:
– ئنجا بۆچی بەبەرچاوی خەڵکەوە ڕەمییان کردوون؟
مام قادریش بێگومان ئەوکاتە دەبووایە بۆی روون بکاتەوە و بڵێ:

لەناو چایخانەکەی مام سەدرەدینی لۆبیافرۆش شێرۆ مەدفەع و جەمال سێوان بەشەڕهاتبوون. تەها قوزێ قسەکانی ئەو ڕۆژەی جەمال سێوانی بۆ شێرۆ مەدفەع گێڕابۆوە و ئەوەیشی خستبووە سەر گوایە جەمال سێوان گوتوویەتی «شێرۆ مەدفەعی حیز چیە ئەگەر ڕائید نەعیمی برا بەعسییەکەی، لەپشتی نەبێ!؟». جەمال سێوان، داخ لە دڵی بەعس و شێرۆ مەدفەع «کە پشتی تەنیا بە برا ئیستیخباراتەکەی ئەستوورە» پێنج چەقۆی لە شێرۆ مەدفەع دابوو، بۆ خۆیشی غاری دابوو: پۆلیس نەیاندەزانی لەکوێیە!

تەها قوزێ دەیگوت: «جەمال سێوان تۆڵەی یووسفی بنعامی خۆی لە شێرۆ مەدفەع کردۆتەوە». کەسیش نەیدەزانی ڕایکردۆتە کوێ، تەنیا عوسمان توورگە دەیزانی: جەمال سێوان سەری خۆی هەڵگرتبوو و ڕایکردبوو بۆ ناو پێشمەرگان.

یاسین بیری لەوە دەکردەوە بچێتە ناو چایخانەی منداڵبازەکان و گوێیان لێ ڕابگرێ: بزانێ لەوێ چی لەبارەی یووسفی برایەوە دەڵێن.. هەروەها بزانێ تاهیر تەسبیح چ دەکا و چ دەڵێ!؟

یاسین بڕیاری دا بێ ئیزنی باوکیشی ئەم کارە بکات. بۆ نا؟

یاسین هەمان ئێوارە چووە چایخانەکەی مام سەدرەدینی لۆبیافرۆش: دەیزانی جەمال سێوانی بنعامی باوکیشی لەو چایخانەیە دادەنیشێ و دەتوانێ پەی بەم جۆرە پرسیارانە ببا.

---

– بۆئەوەی خەڵک چاوترسێن بکەن و عەسکەرەکانی دیکە چیتر نەوێرن فیرار بکەن.

لەوکاتەشدا ڕۆستەم حەتمەن دەیپرسییەوە:

– ئنجا کێ دەڵێ هەر هەشتیان فیراری عەسکەری بوونە.

لەوکاتەشدا مام قادر دەبووایە بە چەند جنێوێک داخی دڵی خۆی دژی حکوومەت هەڵبڕێژێت و بڵێ:

– بێگومان لەوانەیە خەڵکی سیاسی و زۆر بێگوناهی دیکەشیان لەگەڵ بوویێت.

بۆیە، مام قادر وای بە باشتر زانی باسی ئەم مەسەلەیە لای ڕۆستەمی شاگردی خۆی نەکاتەوە. گوتی:

– هیچ.. هەروا.. گوتم بزانم چەندت ماوە بۆ عەسکەری.

ڕۆستەم، لەبەرخۆیەوە گوتی:

– ئای یووسفی بەستەزمان..!

«جەیران» خوشکی گەورەی بەڵقیس خان، لەوەتەی ئەو کارەساتە ڕووی دابوو، هەموو ڕۆژ جارێک سەری لە بەڵقیسی خوشکی دەدا.

جەیران ئەو بەیانییە، زوو، خۆی بە ژووردا کرد و عەباکەی فڕێ دا و لە نەسرینی خوشکەزای پرسی:

– بەڵقیس سحەتی چۆنە؟

– باشترە.

چوو لەلای بەڵقیسی خوشکی دانیشت، گوتی:

– بەڵقیس گوێ بدێ! ئەوا ئاشکرا بوو، هەموو خەڵکیش هەر وا دەڵێن کە یووسف یان ئەوەتا حکوومەت گرتوویەتی یانیش ڕفاندوویانە. یووسف عەیلاقەی بە «مەلا چاو بە کل» و مەولوود منداڵبازەوە نیە. یووسف ڕفێندراوە.

– بردوویانە بۆ کوێ؟

– بەس خوا دەزانێ. حیز و دزی ئەم شارە بردوویانە. غێر دەبێ سۆراغێکی بکەین! جابیر چ دەڵێ؟

– چ بڵێ قوڕبەسەرە؟ چ بکا! هەر دێت و دەچێ و سۆراغ دەکا. خۆ دانەنیشتووە: لەمماڵەوە بۆ ئەو ماڵ و لەم مەخفەرەوە بۆ ئەو مەخفەر. نازانم چ دەکا! چ بکا؟! ئەمڕۆ وابزانم چووە بۆ مەحکەمە.

– ئنجا گوێ بگرە!
– بەڵێ.
جەیران سۆتەکەی جگەرەکەی بەنەرمییەوە ڕۆکردە سەر عەردە چیمەنتۆبیەکەی بەردەم خۆی و گوتی:
– هەمـــوو عـــالەم باسی سـەیدە سـۆرەی لای مزگەوتی سپی دەکەن!
نەســـرینی خـــوشکی یووسف، چاوی ســـوور هەڵگەڕابوو هێندەی بگری، بە ئەڵهـاوە تەمـاشـای دەمی جەیرانی پووری دەکرد:
– دەڵێن «کچێکی پارچەڵەی وەکو نەسرین لەلای خـۆی دادەنێ، سـەری بە پەڕۆکـێکی قـەدیفـەی کەسکی ئەستوور دەبەستێتەوە. جامێک ئاوی سەوز و ســووریشی لەپێش دادەنێت و مـوویەکی ردێنی خۆی لەسەر سەری دەسووتێنێ و پاشان ئایەتێکی لەســەر دەخــوێنێ. ئیــدی، نەســرین، پاش ئەوەی ئایەتەکـەی لەسـەر دەخـوێنرێ، ئاگـای لە ئێـمـە نامـێنێت و دەکەوێتە دنیـای غـەیبـیـاتەوە.. هەر تەماشای ناو جامە ئاوە زەرد و سوورەکە دەکات و وردە وردە، پاش پێنج دەقـیـقـە، نەسرین یەکسـەر دەکـەوێتـە قـسـە: سـات بە سـات ئەوەمـان بۆ دەگـێـڕێتـەوە کـە یووسف، هەر لەو کـاتەوەی کـە

یاسین، لەناو پۆل، کاتێ تەماشای مامۆستا چەتۆی دەکرد (تیۆری ئەرخەمیدسی بۆیان لێکدەدایەوەو لە هەمان کاتدا لەناو گیرفانی پانتۆڵەکەیەوە گەڵ و گونی خۆی هەڵدەپشافت) ئەو قسانەی ئیسۆی کوڕی مام خەلیفەی بیر دەهاتەوە کە هاوپۆلی خۆی بوو، دەیگوت:

– من بە چاوی خۆم مامۆستا چەتۆم دیوە چەندین جار گەنجۆی هاوڕێمانی پەلکێش کردۆتە ناو مەرسەمەکە.

یاسین بیری لەم قسانە دەکردەوەو تەماشای مامۆستاکەی خۆی دەکردو لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

تۆ بڵێی مامۆستاش مندالّباز بێ؟!

بەهیجەخانی ژنی ئەنوەر کۆترباز، پێش نوێژی نیوەڕۆ، چووبووە دوکانی مام قادری قەیماغفرۆش. دەیزانی کە مام قادر زۆر برادەری مەلا چاو بە کلی برایەتی و هەواڵی دەزانێ. مام قادر لەوێ نەبوو. بەهیجەخان بە ڕۆستەمی شاگردەکەی گوتبوو:

– با سەرێک لە ماڵمان بدات و بزانین بۆچی مەلای برام هێشتا هەر بەرنەدراوە؟

ماڵەوەی بەجێ هێشتووە هەتا ئێستا، چی بەسەر هاتووە، هەمووویت بۆ دەگێڕێتەوە. باسی هەموو شتێکت بۆ دەکا کە بەسەری هاتووە، پێشت دەڵێ کە ئێستا لەکوێیە. لەناو جامەئاوە سەوز و سوورەکەوە ئەو شتانە دەبینێ. دەڵێن تەنانەت ناوی هەموو ئەو کەسانەشت پێ دەڵێ کە لەگەڵ یووسف بوونە و یووسفیان ڕفاندووە.

بەڵقیس خان گوتی:

– منیش ناوی سەیدە سۆرەی مزگەوتی سپیم بیستووە. کاتی خۆیشی، زێڕی ماڵی کچەکەی «بیلال ئۆتراقچی» ئەو مەلا سۆرەیە بۆی دۆزیبوونەوە.

– دەی. کەواتە، با بچین! دەڵێن: تەنیا یەک مریشکەسوورەی بۆ دەبەیت و شتێکی کەمیشی دەدەیتێ.

نەسرینی خوشکی یووسف فرمێسکەکانی خۆی دەسڕییەوە، پێی خۆش بوو ئەگەر بچن. بەڵقیس خان گوتی:

– با جابیر بێتەوە. بزانم دەڵێ چی؟

یاسین لە مەکتەب بوو، لەناکاو زەکەریای کوڕی سابیر سەیدۆکی دراوسێیان لە دەرگای پۆلەکەی دا، مامۆستا دەرگای لێکردەوە و گوتی:
– چیت دەوێ کوڕم؟
زەکەریای کوڕی سابیر سەیدۆک گوتی:
– مامۆستا، بە یاسین بڵێ: دایکی شێت بووە، باوکی دەڵێ «هەر ئێستا بگاتەوە ماڵی خۆیان».

---

مام قادری قەیاغفرۆش کوڕە پارچەڵەکەی خۆی هەناردە ماڵی جابیر جەنازە، پێی گوت:
– بڕۆ بە دایکت بڵێ: چیی کرد! با بێتەوە!
عەقیلەخان هەرکە گەیشتە حەوشەی ماڵەکەی خۆیان، دایە پڕمەی گریان و لاڵانەوە:
– کەس نەبینێ یاخوا! ئەو ژنە جوانە، بزانە چیی لێ هاتووە!
– چیی لێ هاتووە؟
– شێت بووە.. شێت! وەیش!
– بەڵقیس خان! شێت بووە؟!
– وەیش، چاوم کوێر بێ، قادر! نەمیدەناسییەوە. بە منی دەگوت «بڕۆ تەیرەکانی عاسمانم بۆ بژمێرە. بزانە ئەمڕۆ چەندی دیکەیان مردوون..
– بەڵقیس خان شێت بووە؟
– لە چاوان کوێر بم، قادر. کەس ناناسێتەوە.
مام قادر گوتی: «لا حول و لا قوە الا باللە..

بەڵقیس خان، لەناو جێگا، دوو لێفەیان پێ دادابوو. سەرکۆت، قژ هەڵواوی: چارۆگە سپییەکەی بەسەر نێوچەوانییەوە نەمابوو، تەسبیحە سەد و یەک قلیییەکەیشی لەژێر پلاکی گلۆپەکە، بە بزمارێکەوە هەڵواسرابوو. پرخەیەکی ماندووی دەهات.
جەیرانی خوشکی گەورەی، دەستێکی گرتبوو. نەسرینی کچیشی لەوبەرەوە دەستەکەی دیکەی. جەیران بیری دەکردەوە و تەماشای فیدانی خوشکە ناوەنجییەکەی دەکرد کە لەوبەر دانیشتبوو، ڕوندک تنۆک تنۆک بەسەر ڕوومەتیدا دەهاتنە خوار:
(جارێکیان یووسف ترسابوو. بەخۆی و بەڵقیس و فیدانی خوشکە ناوەنجییەکەیان، چوون یووسفیان بردە لای «سەیدێکی حاڕ» کە مجێوری مەرقەدی سوڵتان موزەفەر بوو. «مام سەید» گوتی: «ئەم منداڵە زۆر خراپ ترساوە». فیدان گوتی: «بە چی چاک دەبێتەوە؟». مام سەید گوتی: «دەبێ مسی لەسەر بتوێنمەوە». مام سەید چوو تۆپەڵێک مسی لەسەر سەری یووسف ڕاگرت و گرێکی بەتینی لە مسەکە بەردا. مس تنۆک تنۆک بەسەر سەری یووسفدا دەتووایەوە. تنۆکە مسە توواوەکان کاتێ

عوسمان توورگه و تاهیر تەسبیح و عوسە کەڕ، سێ قۆڵی مەوعیدێکیان هەبوو: لە چایخانەکەی قوژبنی گەراجی کۆیەوە چایەک بخۆنەوە و پاشان پێکەوە سەردانێکی شێرۆ مەدفەع بکەن لە «مستشفی صدام» کە دەیانگوت «لەسەر مردنە».
عوسمان توورگە پیاڵە چایەکەی هەڵقورتاند:
– با بڕۆین.
تاهیر تەسبیح گوتی:
– شێرۆ مەدفەع ئەگەر چاک ببێتەوە، لە جەمال سێوان خۆش نابێ، دەزانی!
عوسە کەڕ گوتی:
– ئەرێ بەشەرەفم ئەژدادی هەموویان دەسووتێنێ.
عوسمان توورگە دەیزانی:
– ڕائید نەعیمی برای لە ئێستاوە باوک و برا بچووکەکەی و تەنانەت دایک و خوشکەکانی جەمال سێوانی پەلکێشی زیندان کردووە.
ئنجا عوسمان توورگە گوتی:
– ئەگەر پزیشکی ئەم ئاگرە جابیر جەنازەیش نەگرێتەوە، باشە.
– جابیر جەنازە بۆ؟
– چۆن؟ جەمال سێوان خزمی جابیر جەنازەیە.

دەکەوتنە ناو جامە ئاوەکە، شێوەی جۆراوجۆری عەنتیکەیان لێ دروست دەبوو کە دەتگوت وێنەی گیانەوەر و مرۆڤی دڕندەن. مام سەید گوتی:
– ئەها سەیری ئەو شکڵە عەنتیکانەی ناو جامە ئاوەکە بکەن! منداڵەکەتان لەم شکڵانە ترساوە.
فیدان دیسان بەپێش خوشکەکان کەوت و پرسی:
– ئەم شکڵانە شکڵی چین، مام سەید؟
جەیران گوتی: لە شکڵی حەیوانات دەچن.
مام سەید گوتی:
– نەخێر، شکڵی ئینسانن. کوڕەکەتان لە حەیوانات نەترساوە، لە بەشەر ترساوە.
ئنجا مام سەید جەختیی کردەوە، گوتی:
– ئەها تەماشای شکڵەکان بکەن. ئەم منداڵەتان لە خەڵکی گەورە ترساوە، لەو پیاوانەی کە تەسبیح و قامە و چەقۆیان بەدەستەوەیە. ئەوەتا، تەماشاکەن: دیارە..
جەیران لەتەنیشت لاشەی بەلقیس خان، چاو تژی ڕوندک، تەماشای فیدانی دەکرد، گوتی:
– فیدان، پێم وایە سبەینێ بیبەینە سەر سەیدە حاڕەکەی سوڵتان موزەفەر..

عوسه کەڕ گوتی: «بەڕاست؟».
- ئەدی.
- ڕائیـد نەعـیـمی برای دەڵێ: «جابیـر جەنازە، کوڕەکەی لەگەڵ پێشمەرگان کار دەکات؛ پێشتریش هەر لە سۆنگەی یووسفی کوڕی ئەو بوو کە سێ شەوان شێرۆی برامی بەگرتن دابوو».
تاهیر تەسبیح گوتی:
- دە بەخـوا ڕاست دەکەی: جـابیـر جـەنازە ویستوویەتی تۆڵەی کوڕەکەی لە شێرۆ بکاتەوە.
- ڕائیـد نەعـیـمی برای گـوتوویەتی: «ئەم سێ چەقۆیەی جەمال سێوان فیتی جابیر جەنازەیە».
- بەڕاستتە؟
- ڕائیـد نەعـیم گـوتوویەتی: «خۆم دەزانم چی لە جابیر جەنازەی باوکی ئەو یووسفە حیزە دەکەم».

- خـەڵکی هەولێـر، کـەس کچ و خـوشک و ژنی خۆی ناهێنێتە دەرەوە. ئیدی پیاو لەم شارەدا ناچار دەبێ عاشقی هاوجنسی خۆی بێ.
- استغفرالله.. یەعنی چۆن، دختۆر؟
- تۆ ئەم سـەر تا ئەوسـەری بازاڕی هەولێـر تەی دەکەی، ژنێک یان کچێک نابینی.
- ئێ..!؟
- ئەم شارە گەورەیە پیـاوێکی تێدا نیـە... کە ژنەکەی خۆی یان کچەکەی خۆی بنێرێتە دەرەوە یان هیچ نەبێ لەگەڵ خۆی بیانهێنێتە دەرەوە.
مام قادری قەیاغفرۆش بیری لەم قسانەی دکتۆر زەکەریای کـوڕی ئەحـمـەدئاغـای دۆغـرەمـەچی دەکردەوە، کە تازە دکتۆرای لە بواری نژداریی هەناو لە لەندەن هێنابۆوە و عـیـادەیەکی پزیشکیی لە نزیک دەرمانخانەی شیـمال کردبۆوە. مام قادر بە بیریەتی کە لە دکتۆر زەکەریای پرسی:
- ئنجا ئەمە پەیوەندیی بە منداڵبازییەوە چیە؟
دکتۆر زەکەریا پێی گوتبوو:
- ئەم بەزمەی منداڵبازی، لە هەولێر، بەرەنجامی ئەم لەیەکتر دابڕانەی جنسی نێر و مێیە لە یەکتری.
گوتبووی: «چۆن؟».

دووای ئەوەی جـەمـال سـێـوانی بنعـامی بـاوکی یاسین سێ چەقـۆی وەشـانـدبووە شـێـرۆ مـەدفـەع و غـاری دابووە ناو پێـشـمـەرگان، عـوسـمـان توورگـە، پیاوانە و بەپەلە، چوو ئاگاداری مام جابیری باوکی یاسین بکـاتەوە: «ڕائیـد نەعـیـمی برای شـێـرۆ مـەدفـەع، باوک و برا و تـەنانـەت دایک و خوشکەکانی جەمال سێوانیشی، پەلکێشی زیندان کردووە».

عوسمان تورگە ئەمەیشی بە باوکی یاسین گوت:

– ڕائید نەعیمی برای شێرۆ مەدفەع دەڵێ: «ئەم سێ چەقۆیەی جەمال سێوان فیتی جابیر جەنازەیە». ئیـتـر مامـە گـیـان، تکایە نەڵێن عـوسـمـان توورگـە بۆمـانی گێڕاوەتەوە: ڕائید نەعیم– من لەوێ بووم– گـوتی: «خـۆم دەزانم چی لە باوکی ئەو یووسـفـە حیـزەش دەکەم». ئیـتـر ئاگاداری خۆتان بن، مـامـە! ڕائید نەعیم لەدەستی دێ بچێ ڕاپۆرتێکتان لەسەر بنووسـێت و بڵێ «کـوڕەکـەی جـابیـر جـەنازە لەگـەڵ پێشمەرگان کاردەکات».

گـوتبـووی: «کچ و کوڕ ئەگـەر هەر لە منداڵییـەوە بتوانن یەکتر ببینن و چاویان بە یەکتر بکەوێ، یان هیچ نەبێ ئەگەر لە تەمەنی هەرزەکارییـەوە بتـوانن یەکتر بناسن، ئەوا کەڵکەڵە و هەوەس و ئارەزووی پیاو هیچ نەبێ کـەمێک دادەمرکێتـەوە و لە هەمان کاتدا پیاو ئەوکاتە زۆر باش دەتوانێ لەوە تێ بگات کـە کچ مـەخلووقـێکی جـوانتـر و شـایسـتـەتره بۆ خۆشەویستی، لەچاو کوڕ».

مـام قـادری قـەیماغـفرۆش، دووای ڕابووربنی ئەو هەموو ڕۆژە، کاتێ بیری لەم قسانەی دختۆر زەکەریا دەکردەوە، سـەری سوڕ دەمـا و هێـشـتـا هەر باوەڕی نەدەهێنا کـە ئەو قـسـانەی ئەم دکـتـۆرە گـەنجـە لە لەندەن گەڕاوەیە «مەعقووڵ» بن.

«عـەلی چاو فلۆقەدۆ» موختاری گەڕەکی تەیراوە، پیاوێکی بالابەرز، کەوا و سەڵتە لەبەر، سەر ماش و برنج، دوو چاوەکـانی لەودیو چاویلکەکـانییـەوە دەتگوت دوو چاڵی بچکۆلەی پڕ بەڵغەمی پیسن.

خەڵکی تەیراوە کاتی خۆی پێیان دەگوت «عەلی چاو فلۆقەدۆ»، بەڵام لەو ڕۆژەوەی عەلی چاو فلۆقەدۆ لە حـەج گـەڕایەوە و لەلایەن دائیـرەی ئەمنی هەولێـرەوە کرایە موختـاری تەیراوە، هەندێ خەڵک وردە وردە ڕاهاتن پێی بڵێن «حـاجی عـەلی مـوختـار». نیـوەڕۆ بوو، لە دەرگـای مـاڵی جـابیـر جەنازەی دا و چاوەڕێی کرد.

ئەوکاتەی لە دەرگا درا، جابیر جەنازە لەژێر سەری بەڵقیس خانی خێزانی دانیشتبوو – کە بەتەواوەتی عەقڵی لەدەست دابوو، تەنانەت لەناکاو جاربەجار هەڵدەستـایەوە بچێت بۆ سـەربان و دەیگوت «دەمەوێ بفڕم، لێرە نەمێنم».

جـابیـر جـەنازە بۆئەوەی بچێ دەرگـا بکاتەوە، بە نەسرینی کچی گوت

– کچم. ئاگات لە دایکت بێ، ئێستا دێمەوە.

مام جابیر، ماندوو، شپرزە، یەخە کراوە، دۆخینی بەسـەر شـەڵوارەکـەیدا هاتبـووە خـوارەوە، چووە ناو

دەرگاکەی خۆیان: «فەرموو».
حاجی عەلی موختار دووای چاک و چۆنی، بە جابیر جەنازەی گوت:
- مام جابیر ئەگەر روخسەتم بدەی، هەندێ پرسیارت لەبارەی یاسینی کوڕتەوە لێ بکەم!
- یاسین؟
- بەڵێ.
- لەبارەی یاسین؟ یان یووسف؟
- یاسین. یاسین. بەڵێ، لەبارەی یاسینەوە.
جابیر جەنازە گوتی:
- خێرە؟ لەبارەی چی؟
- لە ئەمنی بەلدەی هەولێرەوە یاسین راپۆرتی لەسەر دراوە؛ گوایە لەگەڵ «موخەریبەکان» دەستی هەیە..
جابیر جەنازە نەیهێشت حاجی عەلی موختار قسەکانی خۆی تەواو بکات:
- گوێ بگرە، عەلی چاو فلّقەدۆ! یاسینی کوڕی من بەدرێژایی ژیانی تێکەڵ بە سیاسەت و هیچ حزبێکی سیاسی نەبووە. ئێمە خەڵکی فەقیرین و لێمان گەڕێن! پاشان من کوڕی خۆمە و دەیناسم.
«عەلی چاو فلّقەدۆ» گوتی:

- جاریٚ پێش هەموو شتێک دەبێ پێم بڵێی «حاجی» چونکە من حاجیم و..

- نەخێر، پێت ناڵێم «حاجی». جاریٚ بڕۆن یووسفی کوڕە بچکۆڵەکەم بدۆزنەوە، ئنجا وەرن داوای تەحقیق کردن لەگەڵ کوڕی گەورەم بکەن! چما من نازانم ڕائید نەعیمی برای شێرۆ مەدفەعی منداڵباز تەقریری لەسەر یاسینی کوڕم نووسیوە؟

- ڕائید نەعیم کێیە؟

- ڕائید نەعیمی مەسئوول شوعبەی ئەمنی مەخموور، برای شێرۆ مەدفەعی منداڵباز. ئەمە لەبەرئەوەی دوو «نۆط الشجاعە»ی وەرگرتووە، ئیتر دەبێ شەلم کوێرم ناپارێزم بەناو خەڵکی بەستەزمان بکەوێت و تەعەدا لە خەڵکی بێ گوناه بکات؟

- قەشمەری بە ڕائید نەعیمی مەسئوول شوعبە دەکەیت؟

جابیر جەنازە ویستی پاشەکشێ لە یاخیبوونەکەی خۆی بکات، گوتی:

- ئەگەر ئاوها بڕوات من ناچارم بچمە بەغدا و شەکوای خۆم بگەیەنمە «سید الرئیس»!

- شەکوای چی؟

جابیر جەنازە گوتی:

- ڕائیـد نەعـیم وادەزانێ کـە مـن هانی جـەمـال سێوانم داوە بچێ بە چەقـۆ بەر ببێتە گیـانی شێرۆی برای.
- ئنجا وا نیە!؟
- نەخێر. جـەمال سێوان ئەگەرچی بنعامی منە، بەڵام هیچ پەیوەندییەکی بە مەسەلەی یووسفی کوڕی منەوە نیە و ئێمە پێویسـتیمان بە جەمال سێوان نیە بەرگریمان لێ بکا. ئەوان بۆ خۆیان بە شەڕ هاتوون.
- ئەوان کێ؟
- شـێـرۆ مـەدفـەع و جـەمـال سـێـوان. لەسـەر منداڵبـازی بە تەڵەب هاتوون و بەربوونەتە گـیـانی یەکتر.
عەلی چاوفلّقەدۆی موختار گوتی:
- جەمال سێوان سێ چەقۆی لە شێرۆ مەدفەعی برای «ڕائید نەعیم» داوە و چووە بۆتە پێشمەرگە.
- ئنجـا یاسینی کـوڕی من پەیوەندیی بـەم کـارەوە چیە؟!
- هیچ. من بۆ مەسەلەیەکی دیکە هاتووم.
- مەسەلەی چی؟
- یاسین ڕاپۆرتی لەسەر نووسراوە. دەمـەوێ دوو قسەی لەگەڵ بکەم.

شێرۆ مەدفەع لە «مستشفی صدام» لە گیانەڵادا بوو. یەکێک لەو چەقۆیانەی جەمال سێوان لێی دابوو، ریخۆڵەی سمیبوو. عوسە کەڕ لە بەیانییانەوە تا ئێوارە بەسەر سەرییەوە بوو، هەمیشە بە نەغمەیەکی غەمگینەوە بە تاهیر تەسبیحی دەگوت:
– باوەڕ ناکەم بژی.
ڕائید نەعیمی برای شێرۆ مەدفەع، سوێندی خواردبوو «ئەگەر شێرۆم بمرێت و چاک نەبێتەوە»، «ئەژدادی جابیر جەنازەش دەسووتێنم، نەک تەنیا خۆی».
ڕائید نەعیم دەیگوت: «ئەمە هەموو سەبارەت بە کوڕە حیزەکەی ئەو بوو کە شێرۆی برام وای بەسەر هات».

عەقیلە خانی ژنی قادر قەیماغفرۆش، کاتێ مێردەکەی گەیشتەوە ماڵ، هێشتا پشتێنی نەکردبۆوە، پێی گوت:
– بەستەزمانەی..! لەوانەیە بیبەنە مووسڵ و سەری لە کارەبا بدەن.
– بەڵقیس خان؟
– بەڵێ.
پاشان یەکسەر گوتی:
– ئەرێ قادر تۆش سەرێکیان لێ نادەی؟
– با بزانین، ئەم شەو..
عەقیلە خان گوتی:
– ئەمڕۆ هەر چی ژنی گەڕەک هەیە رژابوونە دەوروبەری.
ئنجا گوتی:
– وەیشش.. دەزانی چ ژنێکی نازدار بوو. قادر!
قادر قەیماغفرۆش لەو دەمەدا گوتی:
– مەلا چاو بە کلی بەستەزمانیش، لەناو منداڵ و تووالێ و تاوانبارانی سجنی سەرا، ڕزایەوە.

جابیر جەنازە گوتی:
– تەواو، ئاشکرایە: ڕائید نەعیمی برای شێرۆ مەدفەع دەیەوێ ئەم ڕاپۆرتە بکاتە هەنجەت و بێت تۆڵەی جەمال سێوانی بنعامی من لە «یاسین»ی کوڕم بکاتەوە.. کۆنە قینە و تەواو.
– نەخێر.
– کەواتە دەیەوێ ناچارمان بکات چیتر نەڵێین کە شێرۆ مەدفەعی برای، دەستی لە مەسەلەی یووسفدا هەیە.
حاجی عەلی موختار، وەک ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی دەیڵێ، یانیش بیەوێ بەرگری لە برای ڕائید نەعیم بکات، گوتی:
– یووسفی کوڕی تۆ، «مەلا چاو بە کل» لێی بەرپرسە نەک شێرۆ مەدفەعی برای ڕائید نەعیم.

یاسین، لە ژوور سەری دایکییەوە، چاو تژی روندک، دەستی بەسەر نێوچوانی بەستراوی دایکییەوە، بە باوکی گوت:
– دەڵێن دختۆری باشی ئەعصاب لە مووسڵ هەیە، بابە.. با بیبەینە مووسڵ!
جابیر جەنازە، کە پارەی دختۆری هەولێریشی لە باخەڵ نەبوو، بە کوڕەکەی خۆی گوت:
– بە چی بیبەینە مووسڵ، کوڕم؟
ئیسپۆک خانمی پووری یاسین، لەولاوە هەر دەگریا، بەڵام لەودەمەدا هێور ببوەوە، گوتی:
– بەخوا یەک دوو رۆژی دیکە و دێتەوە سەر خۆی. جارێ مەیبەن بۆ هیچ شوێنێک!
جەیران دایبنابوو ماڵی خۆی بەجێ بێڵێت و بێت لەلای بەڵقیس خانی خوشکی خۆی بنوێت. گوتی:
– بەخوا بیبەینە سەر شێخ و مشایەخان لە هەمووی باشترە، جابیر.

بەهیجە خانی ژنی ئەنوەر کۆترباز، خوشکی مەلا چاو بە کل، کاتێ عەباکەی بەسەری خۆی دادا، دیسان جەختیی کردەوە : «قوربانوو ئۆڵم» ، بە عەقیلە خانی ژنی قادر قەیماغفرۆشی گوت:
– لەبیر نەکەی، بە مام قادر بڵێ: کاکم لەناو حەپسخانەوە خەبەری ناردووە: رازییە ئەگەر ئەو موحامییەکی بۆ بگرێ.
– باشە، غەمت نەبێ.
– دوێنێ لەلای کاکم بووم. دەیگوت: «مادام دەیانەوێ لەسەر منی بسەلمێنن. با مام قادر موحامییەکم بۆ بگرێ..!» .
عەقیلە خان لەکۆتاییدا گوتی:
– پێی دەڵێم، بەڵام وابزانم دەمێکیشە موحامیی بۆ گرتووە.

له «مستشفی صدام» لەناو ژوورێکی تایبەتی نەخۆشان، ڕائید نەعیم لەتەنیشت قەرەوێڵەکە، بەدیار شێرۆی برایەوە ڕاوەستابوو؛ تەماشای شوێنی برینە قووڵەکانی سەر سنگ و زگی براکەی دەکرد:
– لەچاو پێریێ، زۆر باشترە، کاک تاهیر!
پێش ئەوەی تاهیر تەسبیح وەڵام بداتەوە، تەها قوزێ بەتەنگ قسەکەی «ڕائید نەعیم»ەوە چوو:
– الحمدلله..
عوسمان توورگە گوتی:
– دەشڵێن مام قادری قەیماغفرۆش موحامیی بۆ «مەلا چاو بە کل» گرتووە.
ڕائید نەعیم تووڕە بوو:
– ئەمە بەس بۆئەوەی تاوانەکە بەسەر شێرۆی برامدا ساغ بکەنەوە. بە هەموویان دەیانەوێ بڵێن «شێرۆ تاوانبارە».
عوسە کەڕ گوتی:
– ئاخر، ئەگەر شێرۆ کاتی خۆی قومێک ئاوی حەمامۆکی دەرخواردی کوڕەکەی ئەویش بدایە، ئێستا نەدەچوو موحامی بۆ مەلا چاو بە کل بگرێ.

یاسین و یووسف تەنیا دوو سێ ساڵێک نێوانیان بوو؛ وەک دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی وابوون.. بەڵام لەم دواییەدا یاسین وای لێ هاتبوو زۆر جار هەست بکات کە یووسف نەماوە: یان خوانەکا مردووە!
هەموو جارێک یاسین کاتێ نزیک کەنتۆری جلوبەرگەکان دەکەوتەوە بۆئەوەی خۆی بگۆڕێ، هەستی سوگواری و غەمگینییەک دڵی ڕنەک دەدا:
ئەو ڕۆژانەی بیردەکەوتەوە کە بەیەکەوە دەچوونە گەڕەکی ناوقەسران و پرتەقاڵی شۆڕەوەبووی سەر دیواری خانووەکانیان لێ دەکردەوە..
ئەوەی بیردەکەوتەوە کە پێکەوە دەچوونە حەمام سیروان و کاتێ دەهاتنە دەرەوە، یووسف بە سوعبەت بە یاسینی دەگوت «یاسین، عەریف عیسا لەپێش دەرگای حەمام چاوەڕێت دەکا.. ئاگات لەخۆت بێ!»، یاسینیش بە لاقرتییەوە پێی دەگوت «گوو بخۆ. ئەگەر لێشمان نزیک بکەوێتەوە بە قامەیەک هەموو ناو سکی هەڵدەدڕم».
ئەوەی بیردەکەوتەوە کە ڕۆژێک یووسف چەند پێکەنی! پێکەنینی قەت ڕانەدەوەستا! دەیگوت کە دایکی شێخەی هاوپۆلی (ئەوەدەمەی ماڵیان له

مێرگەسوور بووە) ورچ بردوویەتی و تا دوو ڕۆژان هەر بنی پێی دایکی شێخەی لێستۆتەوە..

ئەوەی بیر دەکەوتەوە کە پێکەوە دەچوونە مەلعەب و تەماشای فتبۆڵێنی تیپی هەڵبژاردەی هەولێر و قووەی جەویی بەغدا یان نادی الطلبەیان دەکرد و یووسف دەیگوت:

– یاسین، حەزدەکەم «نەجات خۆری» گۆلێک بکات.

یاسین ئەوەشی بیردەکەوتەوە کە یووسف تا پۆلی چوارەمی سەرەتاییش، لەپکەومازییەکی دایکی، بۆ چاوەزار، هەر بە نێوچوانییەوە بەسترابۆوە و دایکی دەیگوت «بۆئەوەی یووسف بە چاو نەچێ.. جوانە».

یاسین، هەموو جارێک کاتێ ئەم وردە یادگارییانەی بیردەکەوتەوە، چەقۆیەک دەچەقییە دڵی و هۆن هۆن دەگریا..

مام قادری قەیماغفرۆش، دیسان، نزاری کوڕی خۆی بانگ کرد و ئامۆژگاریی کرد:

– کوڕم، ئەم ماوەیە بە هیچ شێوەیەک ناچیتە سینەما و مەسبەح و چایخانە و مایخانان! تێگەیشتی؟

– بەڵێ، بابە.

– لە فەرمایشتم لادەی، سەرت دەبڕم، تێگەیشتی!

– بەڵێ، بابە.

– لەگەڵ خەڵکی لە خۆت گەورەتریش هەڵسوکەوت بکەیت، وەک یووسفی کوڕی مام جابیرت بەسەر دێ!

مام قادری قەیماغفرۆش لە کۆتاییدا گوتی:

– هەر بە هیچ شێوەیەک ناچیتە دەرەوە! لە ماڵ بۆ مەکتەب، لە مەکتەب بۆ ماڵەوە. تێگەیشتی!

نزاری کوڕی مام قادر، لە دەمێکەوە دەیزانی: شەڕێکی توند و تیژ لەنێوان خەڵکی گەورە و خەڵکی بچووکدا هەیە، گوتی:

– باشە، بابە گیان!

جـابیـر جـەنازە لەلایەن تۆژینەوەی مـەحکەمـە و بڕیاری پۆلیـسـەوە ، دەمـێک بـوو -بەتایبـەتیش لەدووای رووداوی کوڕەکەی مام شەریفی چایچییەوە - بۆی وەدیار کەوتبوو کە مەولوود منداڵباز دەستی لە کـارەکـەی یووسـفی کـوڕی ئەودا نەبووە. لەمـە بەتەواوەتی دڵنیا بوو.

مام جابیر دیسان بە حاکم بێواری گوت:

- کەواتە ئێستا دوو ئیحتیمال ماوە: یان ئەوەتا شێرۆ مەدفەعە (کە یاسینی کوڕم زۆر گومانی لێ دەکـا ) یانیش ئەوەتا «مـەلا چاو بە کل»ی فڕنیچییە.

- بەڵێ، بە ڕای تۆ: چونکە کـارەکـە لەناو فڕنییەکەی ئەودا ڕووی داوە.

- بێگومان.

حاکم بێوار گوتی:

- ئاخـر، ناشێ دوو ڕووداو لە یەک سـاتدا لەناو هەمان فڕنیدا ڕوویان دابێ!

مـام جابیـر دەیویست لە مەبەستی حاکم بێـوار باشتر حاڵی ببێت، گوتی:

- یەعنی چۆن؟

- ئێستا ، بەدیار کەوتووە کە ئەو منداڵەی لەناو

فڕنییەکەی مەلا چاو بە کلدا تەعەددای لێکراوە، کوڕەکەی تۆ نەبووە: کوڕەکەی مام شەریفی چایچی بووە.

– ئێ..

– هەروەها ئەمەش بەدیار کەوتووە: مەولوود منداڵباز بووە کە تاوانی ناو فڕنییەکەی مەلا چاو بە کلی کردووە.

جابیر جەنازە گوتی:

– وەلحاصل، من ئەمە دەزانم: کوڕەکەی من هیچ پەیوەندییەکی بەو ڕووداوانەوە نییە کە لەناو فڕنییەکەدا ڕوویان داوە.

حاکم بێوار، لەژێر چاویلکە ئەستوورەکەیەوە، بێدەنگ، لە دۆسیەکەی بەردەم خۆی ورد دەبۆوە. لەناکاو، گوتی:

– ڕاستییەکەت دەوێ: تۆ هەقی خۆتە کە گومانت چۆتەوە سەر شێرۆ مەدفەع.

جابیر جەنازە پرسی:

– ئەدی بۆچی لە هەمان کاتیشدا مەلایان تا ئێستا بەرنەداوە؟

حاکم بێوار گوتی:

– پێم وابێ بەدبەختییەکەی «مەلا چاو بە کل»

لەوەدایە کە شوێنی تاوانەکە هی ئەوە: کارەساتەکە لەناو فڕنییەکەی ئەودا ڕووی داوە. ئەگینا مەلا چاو بە کل هێندە جێگەی گومان نیە.

پاشان گوتی:

– ئەمەتا یەکێک لە بەڵگەکان: شێرۆ مەدفەع تەنیا لە ماوەی پێنج ساڵی ڕابردوودا زیاتر لە نۆ حاڵەتی گیرانی لەسەر منداڵبازی هەیە.

جابیر جەنازە پرسی:

– باشە، گەورەم، لەم حاڵەتانەدا چۆن بەردراوە؟! ئەم تاوانبارە ترسناکە چۆن چۆنی لەلایەن قانوونەوە بەڕەڵا دەکرێ؟! «منداڵباز» چۆن دەبێ ئازاد بژیت؟

حاکم بێوار، گوتی:

– بەداخەوە.. ڕائید نەعیمی برای، مودیر شوعبەی ئیستیخباراتی مەخموورە، دەست دەخاتە ناو قانوونیشەوە. من ئەمە تەنیا لای تۆ دەدرکێنم. تکات لێ دەکەم.. مام جابیر!

– باشە.

ئنجا حاکم بێوار بە دەنگێکی نزمتر گوتی:

– لەوانەیە هەر ئەویش مەلا چاو بە کلی هێشتا لە زیندان هێشتبێتەوە: بۆئەوەی گومان نەکەوێتە سەر شێرۆ مەدفەعی برای خۆی.

جابیر جەنازە گوتی:
- جەنابی حاکم، من بیستوومە پێش چەند مانگێک، ئەو شێرۆ مەدفەعە، کوڕێکی چواردە ساڵانی فەساد کردووە و دایک و باوکی کوڕەکەش، لای حکوومەت دەستیان ڕۆیشتووە، گوتوویانە «تا کچێکمان نەداتێ لێی خۆش نابین».
حاکم بێوار تەماشای دەمی جابیر جەنازەی دەکرد: « ئمممم...».
جابیر جەنازە درێژەی بە گێڕانەوەکە دا:
- شێرۆ مەدفەعیش، ناچار پەلی خوشکێکی سێزدە ساڵانەی خۆی گرتووە و داویەتی بە باوکی منداڵە تەعەدا لێکراوەکە. ئەمە ڕاستە؟
حاکم بێوار چاویلکەکەی لە چاو داکەند و لەسەر مێزەکەی دانا، گوتی:
- منداڵ لە وڵاتی ئێمەدا گەورەترین زوڵمیان لێ دەکرێ، مام جابیر. کەس نازانێ چۆن رزگاریان بکا.
جابیر جەنازە پرسیارەکەی خۆی دووبارە کردەوە:
- شێرۆ مەدفەع پەلی خوشکێکی بچووکی خۆی گرتووە و داویەتی بە باوکی منداڵە تەعەدا لێکراوەکە. ئەمە ڕاستە، حاکم بێوار؟
- تەنانەت قانوون و پەروەردە و زانکۆ و دین و

هیچ کـەسـێک و هیچ شـتـێک ناتوانێ منداڵ لەدەستی پیسی گەورەکانی ئێمە رزگار بکا.
– ئەوەی گێڕامەوە، راستە. حاکم بێوار!؟
حاکم بێوار گوتی:
– منداڵ تەنیا بە گەورەبوونی خۆی، خۆی رزگار دەکا. کاتێ گەورەش دەبێ، بە چی دەچێ.. هاتۆتە ریزی فسق و فەساد و خراپەکارەکانەوە!
ئنجا حاکم بێوار هەناسەیەکی قوولّی خەفەتی هەڵکێشا:
– .. منداڵ لە وڵاتی ئێمەدا گەورەترین زوڵمیان لێ دەکرێ.
جابیر جەنازە دڵنیا بوو کە حاکم بێوار مەبەستی لەم قسانە مام جابیرە: یان هیچ نەبێ، بەم قسانەی حاکم بێوار هەندێک شەرمەزاری و گوناهی رابردووی خۆی بیرکەوتەوە، بۆیە گوتی:
– تۆ مەبەستت لەم قسانە چیە، حاکم بێوار؟
– مەبەستم ئەوەیە بڵێم: من زۆر حەزدەکەم کوڕەکەی تۆ تا ئەو رادەیە بەختەوەر بووبێت و.. نەگەڕێتەوە دنیای پیسی خەڵکی گەورەوە.
جابیر جەنازە هەستی دەکرد کە حاکم بێوار کەمێک سەرخۆشە، ویستی پێی بڵێ: «ئەوە تۆ

وڕێنە دەکەی، حاکم بێوار!؟»، پێی گوت:
– ئەوە تۆ دەڵێی چی، حاکم بێوار؟
– ئێمە هەموومان تاوانبارین بەرامبەر منداڵەکان..
جابیر جەنازە وەک ئەوەی بەرگری لە گوناهە کۆنەکانی خۆی بکات، گوتی:
– مەبەستت چیە؟
حاکم بێوار گوتی:
– من بۆ خۆم زۆر بەداخەوەم کە گەورە بووم و هاتمە ناو دنیای درۆزن و ساختە و فەسادی گەورانەوە.
لە کۆتاییشدا حاکم بێوار گوتی:
– ئێمەی گەورە، هەموومان، پێویستە بتوانین منداڵیی خۆمان رزگار بکەین.

یاسین، ئەو شەوە، دیسان خەونێکی عەنتیکەکەی دیتەوە:
ببووە فریشتەیەک و دەفڕی. هەر بە ئاسمانەوە باڵەکانی لێک دەدا و وردە وردە گەیشتە سەر گەڕەکی تەعجیل (ئەو گەڕەکەی کە هاوڕێکانی خۆی، لەبەر سەلیم ساڕووخ نەیاندەوێرا تەنانەت پێنج دەقیقەش چیە بەشەوان لە ماڵ بێنە دەرەوە و پیاسەیەک لەناو جادە بکەن). چووە سەر گەڕەکی خانەقا (ئەو گەڕەکەی کە هاوڕێکانی خۆی، لەبەر «تەها قوزێ» نەیاندەوێرا تەنانەت بۆ جارێکیش بچنە سینەما حەمرا و فلیمێکی شەمشوون یان رینگۆ تەماشا بکەن). چووە سەر گەڕەکی ناوقەسران (ئەو گەڕەکەی کە هاوڕێکانی خۆی، لەبەر «عەولا تەڕەزان» نەیاندەوێرا بچنە چایخانەیەک دانیشن دەستێک ئەزنیف بکەن).
یاسین، هەر بە ئاسمانەوە، لەبەر دەرگای ماڵی هەر یەکێک لە هاوڕێکانی خۆی، باڵەکانی خۆی لێک دەدا و یەک یەک لە دەرگای ماڵی هەموویانی دەدا. هەموویانی بانگ کرد. هەموویانی کۆکردەوە: لە چایخانەکەی مام عیدۆ– کە عادەتی بوو تەنیا لەوێ بوێرێ دانیشێت – دانیشتن.

یاسین دەیدیت: سبحان الله، هاورێکانیشی، هەموو منداڵەکان، لەناو چایخانەکە، وەک خۆی، باڵیان لێ رووابوو. تەنانەت پۆلیسەکانیش – کە لەبەردەرگا پاسەوانێتیی ئەوانیان دەکرد، باڵیان لێ رووابوو.

لەناو چایخانەکە، پێش ئەوەی یاسین دەست بە قسان بکات، چەند فریشتەیەک، باڵدار، سمێڵ تۆپ، هاتن دەمانچە و فیشەگ و چەقۆ و قامە و خەنجەریان بەسەر یاسین و هاورێکانی دابەش کرد.

ئنجا یاسین دەیویست بکەوێتە قسە و پێیان بڵێ:

– برادەران، ئێمە لێرە کۆبووینەتەوە بۆئەوەی دژی منداڵبازەکان بجەنگین و لەناویان ببەین..

دیتی: برادەرێکی نزیکی خۆی، نەوزاد تیرۆگ (کە شەوێکیان باوکی ئەو نەوزادە، بە تیرۆگ نەوزادی لە ماڵەوە راو نابوو – بۆیە ناویان نابوو نەوزاد تیرۆگ) تیرۆگێکی درێژی ئەستوور بەدەستەوە، لە ناوەراستی هەموو برادەرەکانی راوەستابوو، گوتی:

– ئێمە نەک تەنیا منداڵبازەکان، بەڵکو پێویستە هەموو خەڵکی گەورە (بەتایبەتی پیاوەکان) لەناو ببەین و بیانکوژین.

ئاراس کە پۆلی سێیەمی ناوەندی بوو، جارێکیان لەناو مەسبەحی ئیدارەی مەحەللی، شەفیق شەللاتی بێحامەکەی هێنابووە خوارەوە و ویستبووی ڕایکێشێتە ژوورێکەوە، بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

– هەموو پیاوەکان؟!

– بەڵێ هەموو پیاوەکان. هەموو خەڵکی گەورە بەرامبەر ئێمەی منداڵ تاوانبارن. هەموو خەڵکی گەورە بەرامبەر چارەنووس و داهاتووی ئێمەی منداڵ گوناهکار و بەرپرسیارن.

زیرەک، لە هەموویان بچووکتر، کوڕە دەوڵەمەندێکی ناوقەسران بوو، لە ترسی عەلی بۆقێ – کە هەمیشە لە چایخانەکەی بەرامبەر خەلیل پاسکیلچی دادەنیشت – هەرگیز نەیدەوێرا بچێتە لای خەلیل پاسکیلچی و پاسکیلێک بۆ خۆی بەکرێ بگرێت بۆئەوەی خۆی فێری هاژۆتنی پاسکیل بکات، لە نەوزاد تیرۆگی پرسی:

– یەعنی باوکی خۆشمان؟

– بەڵێ، باوکی خۆشمان. مامەکانمان، خاڵۆکانمان، تەنانەت برا گەورەکانیشمان..

مەریوان کە تا ئەوکاتەش هەر باسی دەکرد کە عوسە ڕووت و مەجید مزەڵڵی وازی لێ ناهێنن،

گوتی:
– بۆچی؟ خۆ ئەوان منداڵباز نین؟!
نەوزاد تیرۆگ گوتی:
– ئەو پیاوانە، ئەو گەورانە، ئەوانەی منداڵباز نین؛ خەتای ئەوانە کە ناوێرن و ناتوانن ئەو منداڵبازانەمان لەکۆڵ بکەنەوە. خەتای ئەوانە کە دەمانخەنە ناو ئەو منداڵبازانەوە. خەتای ئەوانە کە ناتوانن لەدەست ئەو هەموو منداڵبازانە بمانپارێزن. ئەو خەڵکە گەورانەن کە بوونەتە هۆی بەدبەختیی ئێمەی منداڵ و دەردەسەرییەکانمان.
سیروان، کوڕە هەژارێک بوو، تەمەنی پازدە ساڵ، دوو جاران لەبەر دەستی کەریم کەرگێ غاری دابوو، بۆچوونەکەی نەوزاد تیرۆگی پەسەند کرد:
– بەڵێ، هەموو پیاوە گەورەکان، باوکەکانمان، مامەکانمان، خاڵەکانمان.. چونکە ئەوانن کە بەو بچووکی و بێ توانایییەی خۆشمانەوە دەماننێرن بچین لە کارگەکاندا کاربکەین. دەماننێرن لەسەر جادە و لەناو چایخانەکاندا گوڵەبەڕۆژە و بنێشت بفرۆشین و بۆیاغچێتی بکەین، لە دوکانی خوێڕی و توێڕی و منداڵبازەکاندا دەمانکەن بە شاگرد.. ڕۆژانە و قازانجەکانیشمان هەر بۆ خۆیان دەیخۆن.

ئنجا شێروان، بە هەمان شێوە پەسەندی بۆچوونەکانی ئەوانی کرد و گوتی:

– بەڵێ، ئەو خەڵکە گەورانەن کە بوونەتە هۆی بەدبەختیی ئێمە و دەردەسەرییەکانمان.

– بەڵێ، ئێمە پێویستە ئەم شۆڕشە دژی هەموو پیاوەکان و گەورەکان بەرپا بکەین، بەڵام پێویستە لەسەرەتادا بە منداڵبازەکان دەست پێ بکەین.

فەرەیدوون پرسی:

– چۆن دەست پێ بکەین؟

– بیانکوژین.

– تۆڵەی هەموو منداڵێکی ئەتککراویان لێ بکەینەوە.

– بەڵێ.

– تۆڵەی هەموو منداڵێکی لاقەکراویان لێ بکەینەوە.

– ورگی هەموویان هەڵدەدڕین.

– هەموو شتێکمان هەیە: دەمانچە، فیشەگ..

– بە چەقۆ..

– بە خەنجەر..

– بە قامە..

– بە دامربۆکس..

- له ماوەی یەک هەفتەدا هەموویان لەناودەبەین.
- ئیتر ئەم شارە لە مندالّباز پاک دەبێتەوە.
- ئیتر لەمەودووا بە ئارەزووی خۆمان دەتوانین بچینە سینەماکان..
- ئیتر لەمەودووا بەوپەڕی سەربەستییەوە دەوێرین بچینە چایخانەکان..
- ئیتر لەمەودووا دەتوانین بێ ترس تا نیوەشەویش لە دەرەوە بمێنینەوە..
- ئیتر لەمەودووا شەو ژیانی تێ دەکەوێتەوە و کەس ناچارنابێ یەکسەر لە ئێوارەوە بخزێتە کونی ژوورەوە..
- ئیتر دنیا دەبێتە دنیای پاکی مندالآن..
- ئیتر دنیا دەبێتە دنیای خەلّکی پاک و بێگوناح و سادەی وەکو خۆمان.
- بژی مندالّ!
- بمرێ مندالّباز!

لەناو چایخانەکە، مندالّەکان، هەر یەکە و چەقۆیەک یان دەمانچەیەک یان خەنجەرێک بەدەستەوە، هەموویان یەک بە دەنگ هاواریان دەکرد:
- بژی مندالّ!

- بمرێ مندالّباز!

لەو هاتوهاوارەدا بوو، یاسین لە خەونەکەی خۆی بێداربووەوە. کاتێ هەڵسایەوە، لەو سەربانە فێنکەی ماڵی خۆیاندا عارەقەیەکی خەستی کردبوو؛ دڵی تەپ تەپ لێی دەدا. لەناکاو کە ئاوڕی بۆ لای دەستەچەپی خۆی دایەوە، دیتی: باوکی لەنێو جێگەکەی خۆیدا نەمابوو.

یاسین، بەو نیوە شەوە، بە سەر قاڵدرمەکانەوە، تەپ تەپ، چووە خوارەوە. کەمێکیش دەترسا:

- بابە!

باوکی دیار نەمابوو.

- بابە!

باوکی هیچ وەڵامێکی نەبوو.

- بابە..

یاسین لەناکاو دیتی: باوکی.. بە پەتێکەوە، خۆی بە پانکەی بنمیچی ژوورەکە بەستۆتەوە و خۆی هەڵواسیوە. لاشەی باوکی یووسف، وەک گوناهێکی کۆن، وەک شەرمەزارییەکی گەورە.. دەلەنگایەوە.